


زنجیرەی ڕێنوێن بۆ منداڵان



# ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ منداڵان

نووسینی
نهاد جلال حبیب الله

# ژیانی

# هەڵکەوتەکانی ئیسلام

# بۆ منداڵان

نهاد جلال حبيب الله

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ منداڵان.

نووسەر: نهاد جلال حبيب الله.

زنجیرە: زنجیرەی ڕێنوێن بۆ منداڵان(٤).

دیزاینی بەرگ: حکیم أبوبکر.

دیزاینی ناوەوە: نهاد جلال.

چاپخانە: ڕێ نوێ.

ساڵ و شوێن‌و ژمارەی چاپ: ١٤٣٤ کۆچی، سلێمانی، چاپی یەکەم.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە.

نرخ: ١٧٥٠ دینار.

ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٤١١)ی ساڵی ٢٠١٣ی پێدراوە.



Nihad.jalal@gmail.com

**پێشکەشە:**

- بەوەی لە دڵەوە بە کوڵ نزایەك دەكات بۆ باوكی كۆچكردووم ودایكی ئازیزم.
- بە هەموو منداڵێكی ئەم سەر زەویە.
- بە هەموو مامۆستایەك كە سەرقاڵە بە پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵان.
- بە شێرزادی برای بچوك وئازیزمو سایەی كچی نازدارم.
- بە هەر كەسێك لە ژیاندا رەزامەندی خوای نیازە.
- بەوانەی شانازی دەكەن بە موسڵمان بوونیان و لەسەر رێبازی راست هەنگاو دەنێن.

# پێشەکی

سوپاس و ستایش تەنها و تەنها بۆ خوای گەورە، خوایە سوپاس بۆ تۆ تا رازی دەبیت، سوپاس بۆ تۆ کە رازی دەبیت، سوپاس بۆ تۆ پاش رازی بوونت، هەموو سوپاس و ستایشێ بۆ تۆ خودایە بەو جۆرەی شیاوی گەورەیی و تەنهایی خۆتە.

صەلات و سەلامی خوا لە پێغەمبەری خوا، کۆتا نێردراوو سەرمۆری پێغەمبەران و دڵسۆزو خۆشەویستی یەکەمی هەر باوەڕدارێ، خوا لەسەر ئێمە و لەبری ئێمە پاداشتی بداتەوە کە پەیامی خوای بە حەق و بە تەواوەتی گەیاند.

صەلات و سەلامی خوا لە ئالوبەیتی پێغەمبەری خوا کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا وەسفی کردون، صەلات وسەلامی خوا لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا کە خوا لەوان رازی بوو و ئەوانیش لە خوا رازی بوون، چ رەزامەندیەك گەورەتر لە رەزامەندی خوا.

رەحمەتی خوا دابارێت بەسەر شوێنکەوتوانی دروستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئالوبەیتیو هاوەڵانی، ئەوانەی لەسەر مەنهەجی صەحیحی قورئانو سوننەت هەنگاویان نا و پەیامی خوایان گەیاند بە ئاسۆ دوورەکان.

پاش ئەوەی سوپاس بۆ خوای گەورە لە چەند رەمەزانێکی پێشوودا زنجیرەیەکمان دەست پێکرد بۆ منداڵان تا ببێتە بنەرەتێکی پەروەردەیی بۆیان، سوپاس بۆ خوا لە سێ رەمەزانی جیاوازدا ئەم سێ ژمارەمان نووسیو هەموویشیان بە جیا چاپکران:

ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ منداڵان.

ژیانی خەلیفەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ منداڵان.

ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ منداڵان.

وا سوپاس بۆ خوای گەورە ئێستاش ژمارەی کۆتایی زنجیرەکەمان تەواو کرد بە ناونیشانی(ژیانی هەڵکەوتەکانی ئیسلام بۆ منداڵان) تا هەم منداڵانمان لەسەر ژیانی پڕ

خێری ئەو زاناو سەرکردانە پەروەردە بکەین، هەم پێیان بڵێین نموونەی باڵای ئیسلامەتی لە قۆناغی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانیدا قەتیس نەماوە، بەڵکو وا مشتێ نموونە بۆ خەرواری چواردە سەدەی مێژووی ئیسلام کە هەزاران زاناو سەرکردە لەسەر ئەو مەنهەجەی هاوەڵان بوون‌و توانیویانە وەك چراش ئەو رووناکیە بە دەوری خۆیاندا بڵاو بکەنەوە.

هەوڵمان داوە لەم نووسینەدا ژیانی چەند زانا و سەرکردەیەك بهێنین لەسەر بنەمای جیاوازی رەگەزی‌و ناوچەییان بەڵام یەکدەنگی هەموویان لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننەت تا نەوەکانمان بزانن هەموو ئوممەتانی موسڵمان زانایانی رێ راستیان تێدا بووە کە خزمەتی گەورەیان پێشکەش کردووە، بۆ نموونە باسی ئیبن مەندەمان هێناوە کە فارسە، عومەری کوڕی عەبدولعەزیزمان هێناوە کە عەرەبە، ئیبن تەیمیە و صەلاحەدینمان هێناون کە کوردن، موحەممەدی فاتیحمان هێناوە کە تورکە، یووسفی کوڕی تاشفینمان هێناوە کە بەربەریە(صنهاجی)، ئەمەش وێنەی جوانی ئەو برایەتیە ئیمانیەیە کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکردووە.

لە خوای گەورە داواکارین بەهەشتی بەرین بکاتە شوێنی ئەو زاناو سەکردانەو نموونەو هاوشێوەکانیان‌و لە تاوانیان خۆش بێت، ئەم کارەش پاك و پوخت لەبەر خۆی بێت‌و بە دووری بگرێت لە هەر نیازێکی تر، ئەم بەرهەمەو بەرهەمەکانی تری زنجیرەکەش بکاتە خێر و رووناکیەك بۆ منداڵانی موسڵمان و کاریگەری بۆ نەوەی نوێ.

إن أريد إلا الإصلاح ما استطعت و ما توفيقي إلا بالله عليه توكلت و إليه أنيب.

نهاد جلال حبيب الله

٨-٦-١٤٣٤

# ئیمامی مالیك

لەناو شارە شیرینەکەی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) زانایانێکی زۆر دەرکەوتن، چونکە ئەو شارە شاری هاوەڵانی ئازیز بوو، هەم پشتیوانان و هەم کۆچەرانیش لەوێ بوون، زانایانێك دەرکەوتن کە لە خزمەت هاوەڵان یان خوێندکارانی هاوەڵاندا زانستیان وەرگرتبوو بۆیە زانستەکەیان زۆر راست وبێ گومان بوو، یەکێ لەو زانا گەورانەش ئیمامی مالیك بوو رەحمەتی خوای لێ بێت، ئەو ئیمامەی کە ماوەیەکی کەم دوای ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەرکەوت، تەنها نزیکەی هەشتا ساڵ تێپەڕ بوو بوو بەسەر کۆچی دوایی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) کە ئەم زانا گەورەیە لەدایك بوو.

ناوی باوکی ئیمامی مالیك ئەنەس بوو، دایکیشی ناوی عالیە بووە، دایك وباوکی کەسانی زۆر باوەڕدار و چاك بون، خوای گەورە مالیکی بەخشی بەو دوو هاوسەرە کە دواتر بوو بە زانایەکی زۆر گەورەو ناسراوی جیهانی ئیسلامی کە تا ئەمڕۆش بەشێکی زۆری موسڵمانان لەسەر مەزهەبەکەی ئەون.

لە ساڵی ٩٣ کۆچی ئیمامی مالیك لە مەدینە لەدایك بوو، واتە لەو شارەی کە تیایدا بۆ یەکەم جار پێغەمبەر (ﷺ) دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراند و تیایدا مایەوە تا لەوێ کۆچی دوایی کرد، ئیتر ئەو شارە ناسراوە بە شارەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە ئیمامی مالیك ناوی دایە وەرگرتنی زانست و دەچوویە خزمەت مامۆستایان و زانستی وەردەگرت، لەپێناو وەرگرتنی زانستدا نەیدەزانی ماندوو بوون چیە، ئیتر قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد و فەرموودەیەکی زۆری پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەبەر کرد وەك چۆن دەبینین دواتر کتێبی تایبەت بە فەرموودەی نووسی بە ناوی(الموطا) کە هەرچی زانای دواتر هەبون ئەو کتێبەیان لەبەردەکرد.

بنەماڵەکەی ئیمامی مالیك هەموویان سەرقاڵ بوون بە زانستی فەرموودەو لەبەرکردنی فەرمودەکانی پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، بۆ نموونە مامی کە ناسرابوو بە ئەبوو سوهەیل زانایەکی دیاری بواری فەرموودە بوو، هەروەها نەزری برای سەرقاڵی زانست بوو و هەردەم لەگەڵ زانایاندا بوو، دایکی مالیکیش زۆر هاندەری مالیك بوو بۆ ئەوەی مالیکی کوڕی تاو بداتە زانست.

ئیمامی مالیك لە شێوەدا کەسێکی زۆر قۆزو کەشخە بووە، هێندە جوان بووە کە جوانیەکەی لای خەڵك ناسراو بووە، دەموچاوێکی سپی وباڵایەکی پڕو بەرز و موویەکی جوان، ئیتر جوانی ئیمامی مالیك لەناو خەڵکدا باس دەکرا.

پاش ئەوەی تەمەنی مالیك کەمێك گەورە بوو خێرا پووری هات بۆ لای و وتی ئیتر کاتی ئەوە نیە دابنیشیت بەڵکو بڕۆ فەرموودە بنووسەرەوە، چونکە کاتی ئەوە بوو بە تەواوەتی تاو بداتە وەرگرتنی زانست نەك دابنیشێت و بە تەمبەڵی ژیان بباتە سەر.

یەکێك لە مامۆستاکانی ئیمامی مالیك ناوی ئیبن هورموز بوو، جاری وا هەبوو کە ئیمامی مالیك دەچوو بۆماڵی مامۆستاکەی تا زانستی لێ وەربگرێت هەر لە بەیانیەوە دەچوو بۆ ماڵیان و لەلای زانستی وەردەگرت تا ئەو کاتەی دەبوو بە شەوو دنیا تەواو تاریك دەبوو ئینجا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

مامۆستایەکی تری ئیمامی مالیك ئیمام جەعفەری صادق بوو کە لە بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، مالیك چەند فەرموودەیەکی لەم مامۆستایەوە گێڕاوەتەوە، هەروەها دەیان مامۆستای تری هەبوو کە فەرمودەی لەوان وەردەگرت و لە کتێبەکەیدا تۆماری کردوون، دەتوانیت داوا بکەیت لە کەسێکی شارەزا وەك باوکت یان

مامۆستایەکت تا کتێبەکەی ئیمامی مالیکت نیشان بدات کە ئەو فەرموودانەی نووسیوەتەوە کە لە مامۆستاکانیەوە بیستوویەتی و تۆماری کردوون.

ئیتر لە ماوەیەکی کەمدا ئیمامی مالیك بوو بە زانایەکی گەورە و دادەنیشت تا فەتوا بدات بۆ خەڵك، هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە بیست و یەك ساڵ کە فەتوای دەدا بۆ خەڵکی و کێشەی خەڵکی چارەسەر دەکرد و وەڵامی پرسیاری خەڵکی دەدایەوە، هاوکات زۆربەی ئەو پرسیارانەی لێی دەکرا خێرا وەڵامی نەدەدایەوە، بەڵکو دەوەستا تا پرسی دەکرد بە دەیان زانای گەورەی ناو مەدینە لە ترسی ئەوەی نەك لە خۆیەوە وەڵامێك بداتەوەو وەلامەکەی راست نەبێت، ئیتر جاری وا هەبوو بۆ وەڵامی پرسیار و فەتوایەك رای حەفتا زانای گەورەی وەردەگرت، بە مەرجێك ئەوکات تەمەنی ئیمامی مالیك چل ساڵان بوو، واتە ئەو کات زانستێکی زۆری پێ بوو نەك لەبەر ئەوەی نەیزانێت، بەڵکو بۆ ئەوەی بە رای زانایان وەڵامی دروستتر ببەخشێت بە موسڵمانان.

ئیمامی مالیك بۆ هەموو وانەوتنەوە یان نووسینەوەیەکی فەرموودەیەك یان خوێندنەوەی کتێبێك دەستنوێژی دەگرت و بەبێ دەستنوێژ نەدەچوویە بواری زانستەوە، تەنانەت کاتێ دادەنیشت تا وەڵامی پرسیاری خەڵك بداتەوە دەست نوێژی دەگرت، ئەوەش لەبەر رێزی ئەو ئیمامە بوو بۆ زانست، هەروەها بوونی لەخواترسی بوو لە دڵیدا.

هەروەها ئیمامی مالیك زۆر هەوڵی دەدا خۆی بپارێزێت لە نیازی خراپ و روپامایی بەڵکو هەوڵی دەدا زۆر نیازپاکی بەکاربهێنێت لە کارەکانیدا، چونکە دەیزانی هەر کارێك پاك و پوخت لەبەر خوای گەورە نەبێت ئەوا خوای گەورە لێی وەرناگرێت.

ئیمامی مالیك خوێندکارێکی زۆری هەبوو کە ژمارەی خوێندکارەکانی دەگەیشتە نزیکەی ١٤٠٠ خوێندکار، یەکێك لەو خوێندکارانەی ئیمامی شافیعی بوو کە لە خزمەتیدا فەرموودەی وەردەگرت و هەموو کتێبەکەی ئیمامی مالیکی لەبەرکردبوو، ئیمامی مالیکیش ئامۆژگاری ئیمامی شافیعی کرد کە خۆی بپارێزێت لە تاوان چونکە تاوان رووناکی دڵ نامێڵێت و دەیکات بە تاریکی.

دواجار وادەی ژیانی ئیمامی مالیك تەواو بوو، ئەوەبوو لە مانگی رەبیعولئەوەلی ساڵی ١٧٩ کۆچیدا لە تەمەنی هەشتاو شەش ساڵیدا ئیمامی مالیك کۆچی دوایی کردو سەرکردەی موسڵمانان لە مەدینە نوێژی کرد لەسەر تەرمەکەی، بەشێکی زۆری خەڵکی ناو مەدینە بەشدار بوون لە مەراسیمی ئەسپەردەکردنی تەرمەکەیدا.

## پەندو وانە

زۆر پێویستە ئێمەش وەك ئیمامی مالیكو ئیمامەکانی تر هەوڵ بدەین فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبەر بکەین چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هەرچی فەرموودەیەکی فەرمووە خوای گەورە خستوویەتیە دڵیەوەو قسەکەی راست و دڵنیایە، هەر بۆیە هەرچی فەرموودەیەك هەیە بە دڵنیاییەوە راستەو خوای گەورە پێی رازیە.

پێویستە لە خۆمانەوە وەڵامی هەموو پرسیارێك نەدەینەوە، بەڵكو زۆر هەڵەیە لە خۆمانەوە وەڵام بدەینەوە چونکە خەڵك تووشی هەڵە دەکەین بەڵكو دەبێت پرسیار بکەین لە زانایانی شارەزا تا وەڵامی راست وەربگرین ئینجا وەڵامەکە بدەین بە کەسانی تر، دەبینین ئیمامی مالیك بەو هەموو زانستەوە راوێژی کردووە بە زانایانی تر ئینجا فەتوای داوە، بۆیە ئەوە ئیشی هەموو کەسێك نیە فەتوا بدات و وەڵامی هەموو پرسیارێك بداتەوە.

دەبێت هەر کارێکمان کرد پاك وپوخت تەنها لەبەر خوای گەورە بێت، چونکە هەر کارێك نیازی تری تێکەڵ بێت خوای گەورە وەری ناگرێت، هەر بۆیە ئیمامی مالیك هەوڵیدەدا نیازی زۆر پاك بێت بۆ خوای گەورە.

## پرسیارەكان

١. بنەماڵەی ئیمامی مالیك بە چی ناسرابوون؟

٢. ئیمامی مالیك لەكوێ لەدایك بوو و لەكوێ كۆچی دوایی كرد؟

٣. ژیانی منداڵی ئیمامی مالیك باس بكە.

٤. ئیمامی مالیك چی ئامۆژگاریەكی پێشكەش كرد بە ئیمامی شافیعی؟

٥. ناوی كتێبەكەی ئیمامی مالیك چیە؟ تیایدا چی نووسراوە؟

٦. كاتێك پرسیار دەكرا لە ئیمامی شافیعی چۆن وەڵامی دەدایەوە؟

٧. دەتوانیت ئەم ژیانەی ئەم زانایە باس بكەیت بۆ هاورێیەكت؟

٨. ناوی دوو خوێندكاری ئیمامی مالیك بنووسە.

٩. بە چی شتێكی ژیانی ئیمامی مالیك سەرسام بوویت؟

# ئیمامی شافیعی

لە سەرزەمینی پان و بەریندا خاکێك هەبوو کە لانەی پێغەمبەران بوو، گۆڕی زۆربەی پێغەمبەران لەوێ بوو، یەکێك لە خۆشەویستترین مزگەوتەکانی موسڵمانانی تێدابوو کە ئەویش مگەوتی ئەقصا بوو، بەڵێ ئەو خاکە فەلەستینە.

لەم خاکە خۆشەویستەدا کە قودسی تێدایەو ئێستا جولەکەکان داگیریان کردووە، لە شارێکی جوانیدا زانایەکی گەورە لەدایك بوو کە ئەویش ئیمامی شافیعیە.

ئیمامی شافیعی ناوی موحەممەدە، باوکیشی ناوی ئیدریسە، دایکیشی ناوی فاتیمە بووە، ئەم زانا خۆشەویستە عەرەبە وەك چۆن لە نەتەوەکانی تری موسڵماندا زانا دەرکەوت وەك ئیبن مەندە کە فارس بووەو ئیبن تەیمیە کە کورد بووە، یەکێك لە زاناکانی عەرەبیش ئیمامی شافیعی بووە، کاتێك دەڵێن مەزهەبی شافیعی مەبەستیان بە شوێنکەوتنی راو بۆچونەکانی ئەم زانایەیە کە لە روانگەی ئیسلامەوە باسی کردون.

شافیعی لە ساڵی ١٥٠ کۆچی لە غەززە لەدایك بووە، لە تەمەنی دوو ساڵیدا بووە کە دایکی بردویەتی بۆ مەککە، ئیتر لەوێ گەورە بووە، پاشان لە تەمەنی حەوت ساڵیدا هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد، کە تەمەنی گەیشتە دە ساڵ کتێبی (الموطا)ی لەبەر کرد کە ئیمامی مالیك نووسیویەتی، ئیتر بەردەوام سەرقاڵ بوو بە وانە خوێندن و زانست وەرگرتنەوە تا هێندە زانستی پەیدا کرد هێشتا تەمەنی نەگەیشتبووە بیست ساڵی مۆڵەتی پێدرا فەتوا بدات.

هەروەها ئیمامی شافیعی چووە بۆ شاری مەدینە تا لەوێ لای ئیمامی مالیك زانست وەربگرێت، پاش ئەوەش هەر لەپێناو وەرگرتنی زانستدا روویکردە یەمەن، لەوێ

ئیشیشی دەکرد، دوای ئەوەش لە تەمەنی ٣٤ ساڵیدا ئیمامی شافیعی دێت بۆ بەغداد کە ئەو کات پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو و خەلیفەی موسڵمانان لە بەغداد بوو، دوای ئەوەش جارێکی تر گەڕایەوە بۆ مەککەو نزیکەی نۆ ساڵ لەوێ مایەوە، لەو ماوەشدا خزمەتی گەورەی پێشکەش دەکرد بە خەڵك، لە ناو مزگەوتی کەعبەدا وانەی دەوتەوە بە موسڵمانان، کێشەی خەڵکی چارەسەر دەکرد و سەرقاڵی کاروباری موسڵمانان دەبوو.

جارێکی تر ئیمامی شافیعی بریاریدا بچێت بۆ بەغداد، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٥ کۆچیدا جارێکی تر چوو بۆ بەغداد، پاش ئەوەی لەوێ ماوەیەك مایەوەو خزمەتی موسڵمانانی کرد بەو زانستە زۆرەی هەیبوو، وانەی دەوتەوە بە خوێندکاران، لەوانە یەکێك لە خوێندکارەکانی بریتی بوو لە ئیمامی ئەحمەد، هەروەها بۆ چارەسەری کێشەی موسڵمانان دەچوو بۆ لای خەلیفە و کێشەکانی دەگەیاند، بەلام خۆی هەرگیز رازی نەبوو پۆست و دەسەلات وەربگرێت، ئینجا بڕیاری دا بچێت بۆ میصر، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٩ کۆچیدا واتە دوای چوار ساڵ مانەوە لە بەغداد چوو بۆ میصر و لەوێ دەستی کرد بە وانە وتنەوەو بڵاوکردنەوەی زانست لەناو خەڵکدا، هەر لەوێ مایەوە تا ئەوەی لە دوای پێنج ساڵ مانەوە لە ساڵی ٢٠٤ کۆچی لە میصر وەفاتی کرد، هەر لەوێش تەرمەکەی ئەسپەردە کرا.

ئیمامی شافیعی لە مەککە زۆر بە هەژاری دەژیا، ژیانی پڕ لە نارەحەتی و برسێتی و نەبوونی بوو، بەڵام ئەوەی نەدەکرد بە گرفت بۆ ژیانی، بەڵکو بیری لای ئەوە بوو بەردەوام بە دوای زانستدا بگەڕێت، ژیانی زۆربەی زانایانی ئیسلامیش وابووە کە بە هەژاری ژیانیان بردوەتە سەر و زۆر گوێیان لە ماڵو سامانی دنیایی نەبووە چونکە زانیویانە ژیانی دنیا کاتیەو باشتر وایە لەبری خۆشی دنیایی سەرقاڵ بن بە زانستەوە.

ئیمامی شافیعی دەچوویە خزمەت مامۆستایان و فەرموودەی وەردەگرت لێیان و لەبەری دەکرد، ئینجا ئەو فەرموودانەی دەنووسیەوە، ئەمەش نیشانەی ئەوپەڕی تامەزرۆیی شافیعی بووە بۆ زانستی فەرموودە.

شافیعی بۆ ئەوەی زمانی پاراوی عەرەبی وەربگرێت ماوەیەك مەککەی جێهێشت و چوو بۆ لادێکانی ئەو ناوچەیە، چونکە لەوێ بە جوانی زمانی عەرەبی وەردەگرت، لەوێ بەشێکی زۆر زۆر شیعری بڵاوی ناو هۆزەکانی لەبەر کرد.

کاتێ ئیمامی شافیعی هەواڵی ئیمامی مالیکی بیست لە مەدینە بڕیاری دا بچێت بۆ لای تا لە خزمەتیدا زانست وەربگرێت، ئەو کات تەمەنی ١٤ ساڵ بوو، ئیتر کەوتە ڕێ، لەو نێوانەدا قورئانی پیرۆزی دەخوێند و تا گەیشتە مەدینە شانزە جار هەموو قورئانی پیرۆزی خوێندەوە.

کاتێ ئیمامی شافیعی گەیشتە مەدینە چوو بۆ مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) و لەوێ نوێژی کرد، ئینجا ئیمامی مالیکی بینی لای گۆڕی پێغەمبەردا(ﷺ) بوو و فەرموودەی دەگێڕایەوە، ئینجا چوو بۆ لای ئیمامی مالیك، ئەویش پێی وت لەخوا بترسەو خۆت دوور بگرە لە تاوان چونکە تۆ کەسێکی گەورە دەردەچیت، خوا ڕووناکیەکی خستوەتە ناو دڵتەوە تۆیش وریابە بە تاوان ئەو ڕووناکیە نەکوژێنیتەوە، ئیتر ئیمامی شافیعی لە خزمەت ئیمامی مالیکدا دادەنیشت و وانەی دەخوێند.

ئیمامی شافیعی لەکاتی قورئان خوێندندا دەنگی زۆر خۆش بوو وهەموان کە لە دەوری دەبوون سەرسام دەبون بەو دەنگە خۆشەی، تەنانەت ئیمامی مالیك کە مامۆستای بوو سەرسام بووبوو بە دەنگی خۆشی شافیعی لە کاتی قورئان خوێندندا.

جارجارە ئیمامی شافیعی دەگەڕایەوە بۆ لای دایکی بۆ مەککەو سەردانی دەکرد و دواتر دەگەڕایەوە بۆ لای ئیمامی مالیك، هەروەها جارجار دەچوو بۆ شوێنانی تر و دەگەڕایەوە بۆ لای مامۆستاکەی تا ئەوەی لە ساڵی ١٧٩ کۆچیدا مامۆستاکەی کە

ئیمامی مالیك بوو کۆچی دوایی کرد، دوای ماوەیەك دەسەڵاتداری موسڵمانان لە یەمەن هات بۆ مەککە، ئەوەبوو ئیمامی شافیعی بڕیاری دا لەگەڵیدا بچێت بۆ یەمەن هەم بۆ ئەوەی ماوەیەك لەوێ ئیش بکات، هەم بۆ ئەوەی زانست وەربگرێت و زانستیش ببەخشێت، بۆیە چوو بۆ یەمەن و لەوێ ماوەیەك بوو بە بەرپرسی ناوچەی نەجران.

بەڵام لەوێ دەسەڵاتدارێکی خراپ هەبوو کە بەردەوام پیلانی دەگێڕا دژی ئیمامی شافیعی.

پرسیار بۆچی ئەو دەسەڵاتدارە وای دەکرد؟

وەڵام: چونکە ئەو دەسەڵاتدارە ستەمکار بوو و ستەمی دەکرد لە خەڵك، ئیمامی شافیعیش هەموو جار ئامۆژگاری دەکرد و بێداری دەکردەوەلەوەی ستەم حەرامەو جاری وایش هەبوو لێی تورە دەبوو کاتێ دەیزانی هەر لەسەر ستەم بەردەوامە.

بۆیە ئەو دەسەڵاتدارە کەوتە پیلان دانان بۆ ئیمامی شافیعی تا دواجار وا خەلیفەی موسڵمانانی تێگەیاند کە ئیمامی شافیعی دژی خەلیفەی موسڵمانانە، خەلیفەش داوای کرد ئیمامی شافیعی بهێنن بۆ بەغداد، کاتێ شافیعی چوو بۆ لای خەلیفە بەبەڵگە پێی سەلماند کە بێ تاوانە، یەکێك لە دادوەرو زانا گەورەکانیش شایەتی دا بۆ ئیمامی شافیعی، ئیتر باش بوو ئیمامی شافیعی پارێزرا و خوای گەورە رزگاری کرد و پیلانەکەی ئەو دەسەڵاتدارە ستەمکارە سەری نەگرت.

ئیتر ئیمامی شافیعی نەگەڕایەوە بۆ یەمەن، بەڵکو هەر لە بەغداد مایەوەو کەوتە وەرگرتنی زیاتری زانست، لەگەڵ ئەوەشدا وانەی دەوتەوەو چەندین خوێندکاری پێگەیاند کە ئەوانە زۆرێکیان بوون بە کەسی گەورەو هەڵکەوتەی ناو موسڵمانان.

دوای ئەوە ئیمامی شافیعی گەڕایەوە بۆ مەککەو لەوێ کەوتەوە بە وانەوتنەوە لە مزگەوتی کەعبەی پیرۆز، لەوێ موسڵمانانێکی زۆر لە وانەکانیدا ئامادە دەبوون، جگە لەوەی ئەوانەی دەچوون بۆ حەج لەوێ دەچوونە خزمەتی و زانستیان لێ وەردەگرت،

ئەوەش هۆکارێکی گەورە بوو تا ئەو ئیمامە گەورەی ئیسلام زانستی خۆی ببەخشێت بە بەشێکی زۆری موسڵمانان.

دواجار ئیمامی شافیعی لە مانگی رەجەبی ساڵی ٢٠٤ کۆچی و لە تەمەنی پەنجاو چوار ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، مردنەکەشی لە شەوی هەینیدا بوو، بۆ بەیانی کە رۆژ بوویەوە تەرمەکەی نوێژی لەسەر کرا و خەڵکێکی زۆر و بێشومار ئامادە بوون و خرایە ناو گۆڕ.

ئیمامی شافیعی لە مانگی رەمەزاندا زۆر زیاتر خۆی یەکلا دەکردەوە بۆ پەرستشی خوای گەورە و زیاد لە هەموان قورئانی دەخوێند، ئیتر لە شەوو رۆژێکدا خەتمێکی قورئانی پیرۆزی دەکرد.

ئیمامی شافیعی دوای خۆی چوار منداڵی بەجێ هێشت کە ئەوانیش بریتی بوون لە ئەبوو عوسمان و فاتیمە و ئەبوو حەسەن و زەینەب.

# پەندو وانە

قودس خاکی موسڵمانانەو یەکەم جاریش قیبلەی موسڵمانان قودس بووە، بۆیە ئەو خاکە یەکێکە لەخۆشەویست ترین ناوچەکانی سەر زەوی، لە سەردەمانی پێشوودا لەلایەن سەرکردەی موسڵمانان صەلاحەدینی ئەییووبییەوە کە سەرکردەیەکی کورد بوو قودس رزگار کرا، بەڵام ماوەیەکی زۆرە جوولەکەکان ئەو ناوچەیان داگیر کردووەو ئێمەش وەك موسڵمان دەبێت لەبیرمان بێت کە هەر دەبێت رۆژێك بێت ئەو شوێنە رزگار بکەین و بیگێڕینەوە بۆ ژێر دەستی موسڵمانان.

نابێت هەرگیز وا بیر بکەینەوە بڵێین ئێمە منداڵین و ناتوانین زانستی زۆر وەربگرین و نابین بە زانا، بەڵکو وەك دەبینین زۆربەی زانایانی ئیسلام هەر بە منداڵی زانستی زۆریان وەرگرتووەو توانیویانە، بۆیە ئێمەش ئەگەر پشت ببەستین بە خوای گەورە دەتوانین ئێمەش زانستێکی زۆر وەربگرین و ببینە کەسی وا کە زانستی زۆرمان پێ بێت.

ژیانی زۆربەی زانایانی ئیسلام پڕ بووە لە نارەحەتی و هەژاری و ئەوان بە نەبونی ماددی ژیاون، بەلام هەموویان بەوە رازی بونو شوکری خوایان کردووە، چونکە ماددەو سامانی دنیا بۆ ماوەیەکی کاتیە، هەموو ئەوانەی کاتی زوو پارەو سامانیان هەبوو سامانەکەیان نەماو لەناوچوو، بەڵام ئەوانەی زانا بوون تا ئەمڕۆش زانستەکەیان ماوەو موسڵمانان رەحمەتیان بۆ دەنێرن و نزای خێریان بۆ دەکەن.

هەمیشە گومانی خێرمان هەبێت بەو رووداوانەی دێنە رێمان، چونکە خوای گەورە زۆر جار کارو رووداوێك دێنێتە رێمان کە لەوانەیە خۆمان پێمان خۆش نەبێت، بەڵام لە بنەرەتدا ئەوە چاکترین شتە بۆمان، وەك دەبینین کاتێك ئیمامی شافیعی لە یەمەنەوە بانگ کرا بۆ بەغداد تا دەسەڵاتی لێ بسەنرێ ئەو رووداوە بوو بە خێر تا بە یەك

جارەکی تاو بداتە بواری زانستو لایەنەکانی تر کەنار بخات، بەوەش بوو بەو زانا گەورەی کە تا ئەمڕۆش هەموومان قەرزاری هەوڵو زانستی ئەوین.

مردن دێتە ڕێی هەموو کەس و نابێت هەرگیز مردنمان لەبیر بچێت، بەڵکو دەبێت ئەوە بە دەرفەت وەربگرین تا لە ژیاندا ماوین خزمەتی چاك بکەین و خێر وچاکە کۆبکەینەوە بۆ ڕۆژی دواییمان، چونکە کەسی ژیر ئەوەیە چاکە پێش خۆی بخات بۆ ڕۆژی دوایی تا لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە بەهەشتی پێ ببەخشێت.

# پرسیارەکان

١- ئیمامی شافیعی ناوی چی بوو؟ لە کوێ لەدایك بوو؟

٢- ئایا دەزانیت ئیمامی شافیعی لە تەمەنی منداڵیدا چی کرد؟

٣- بۆچی ئیمامی شافیعی چوو بۆ یەمەن؟

٤- پەیوەندی نێوان ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی چۆن بوو؟ باسی بکە.

٥- خەلیفەی موسڵمانان بۆچی ئیمامی شافیعی بانگ کرد بۆ بەغداد؟

٦- ئایا ساڵی مردنی ئیمامی شافیعی دەزانیت؟

٧- بە چی شتێکی ئیمامی شافیعی سەرسام بویت؟

# عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

ئەم باسەی لێرەدا ئەیخەیتە روو باسی ژیان و بەسەرهاتی یەکێکە لە گەورە هەڵکەوتەکانی ئیسلام کە هەم لەلایەکەوە زانایەکی گەورە بووەو هەم خەلیفەو سەرکردەی موسڵمانان بووە، ئەوەش گەورەییەکی زۆرە کە خوای گەورە لەیەك کاتدا ئەو دوو هەڵکەوتەییەی بەخشیوە پێی، ئەویش عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە، ئەم عومەرە جیایە لە ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب کە خەلیفەی دووەمی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، بەڵام هەر لە نەوەی ئیمامی عومەرە.

ناوی باوکی عومەر عەبدولعەزیزە، دایکیشی ناوی لەیلایە، باپیری لەیلا ئیمامی عومەری کوڕی خەتتابە، واتە ئیمامی عومەر باپیری دایکی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزە.

کاتی خۆی ئیمامی عومەر شەوێك بە کۆڵانەکاندا دەگەڕا، بینی کچێك و دایکێك سەرقاڵن شیر ئامادە دەکەن بۆ بەیانی تا بیفرۆشن، ئەوەبوو دایکی بە کچەکەی وت کچەکەم ئاوی زۆری تێ بکە با شیرەکە زۆر بێت و پارەی زیاتر بکات، ئەویش وتی دایکە وا ناکەم، دایکی وتی خۆ عومەری خلیفەی موسڵمانان نامانبینێت، کچەکەی وتی دایکە گیان خۆ ئەگەر عومەر نەمانبینێت ئەوا خوای گەورە دەمانبینێت، بۆیە ئیمامی عومەر بەوە سەرسام بوو و بڕیاری دا داوای ئەو کچە بکات بۆ کوڕێکی، لە نەوەی ئەو کوڕەی عومەر و ئەو کچەوە ئەم منداڵە ئازیزە لەدایك بوو کە ناوی نرا عومەر و وەك باپیرە گەورەی هەم بوو بە زانایەکی گەورە و هەم بوو بە خەلیفەی موسڵمانانیش.

عومەر لە ساڵی ٦١ کۆچی لە شارەکەی پێغەمبەری خوا شاری مەدینەی خۆشەویست لەدایك بوو، ئەو شارەی کە مەڵبەندو لانەی زانایانی گەورەی ئیسلام بوو،

لەناو شارە شیرینەکەی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) زانایانێکی زۆر دەرکەوتن، چونکە ئەو شارە شاری هاوەڵانی ئازیز بوو، هەم پشتیوانانو هەم کۆچەرانیش لەوێ بوون، زانایانێك دەرکەوتن کە لە خزمەت هاوەڵان یان خوێندکارانی هاوەڵاندا زانستیان وەرگرتبوو بۆیە زانستەکەیان زۆر راست وبێ گومان بوو.

ئیتر عومەر لەو شارەدا لەدایك بوو و هەر لەوێش لەسەر دەستی ئەو زانایانە زانستی وەرگرت، بۆیە خوای گەورە کردی بەو کەسە هەڵکەوتەی ئیسلام، ئیتر ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوەو لای زانایانی ئەو شارە زانستی وەرگرت بەتایبەت زیاتر لای مامۆستایەکی بوو بە ناوی صالح.

دواتر مامی کە خەلیفەی موسڵمانان بوو و ناوی عەبدولمەلیك بوو و لە دیمەشق سەرکردایەتی دەوڵەتی ئیسلامی دەکرد داوای کرد عومەری برازای بچێت بۆ دیمەشق بۆ لای، ئەوەبوو عومەریش چوو بۆ ئەوێ و هەر لەوێش پاش ماوەیەك مامی کچێکی هەبوو کە ناوی فاتیمە بوو ئەو کچەی پێشکەش کرد بە عومەر و هاوسەرگیرییان ئەنجامدا، واتە خێزانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئامۆزای خۆی بوو.

عەبدولمەلیکی مامی زۆر مەبەستی بوو ئەو برازایەی وەك کەسێکی گەورە پەروەردە بکات، بۆیە کردی بە بەرپرسی ناوچەیەکی دیاری کراو لە نزیك حەلەب کە پێی دەوترا دیر سەمعان، عومەریش بە جوانی توانی سەرکردایەتی ئەو ناوچەیە بکات و ئەوپەڕی چاکە و دادپەروەری بەکاربهێنێت، تا ساڵی ٨٦ کۆچی وەك والی و سەرکردەی ئەو ناوچەیە مایەوە.

عومەر دەموچاوێکی ئەسمەری هەبوو، جەستەی کەمێك لاواز بوو، ریشێکی زۆر جوانی هەبوو، ئیتر جوانیەکی بەرچاوی هەبوو، سەر بە بنەماڵەی ئومەویەکان بوو، لای

هەموان خۆشەویست بوو، چونکە زۆر راستگۆ و نەرمونیان بوو، ئازاری کەسی نەدەدا، هەوڵی دەدا یارمەتی هەموان بدات.

دوای ئەوەی عەبدولمەلیکی مامی کۆچی دوایی کرد ئەوەبوو وەلید کە ئامۆزای عومەر بوو بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، وەلیدیش خۆشەویستی زۆری هەبوو بۆ عومەری ئامۆزای، نەك بەس لەبەر ئەوەی ئامۆزای بوو، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە کەسێکی زانا بوو و زۆر بەڕێز و چاکەکار بوو، بۆیە وەلید بڕیاری دا عومەر بکات بە بەرپرسی شاری مەدینەی خۆشەویست، پاش ئەوەی عومەر بوو بە والی و بەرپرسی ئەو شارە توانی زۆر سەرکەوتوو بێت و هەموان لێی رازی بوون، خەلیفە وەلید بڕیاری دا ناوچەی تائیفیش بخاتە ژێر دەستی عومەرەوە.

عومەر مەرجی دانابوو کە نابێت ستەم لە کەس بکاتو بە دادپەروەری بجووڵێتەوە، هەروەها بڕوات بۆ حەجی ماڵی خوای گەورە و حەج بکات، عومەر خێرا لە مەدینە بڕیاری دا کۆمەڵێك لە زانایان کۆ بکاتەوە تا لە هەموو شتێکدا راوێژیان پێ بکات، بۆیە ئەنجومەنی راوێژی دامەزراند کە تیایدا دە زانا بەشدار بوون، ئیتر لە هەموو شتێکدا راوێژی دەکرد پێیان، بەوەش نەیدەهێشت هیچ شتێك بە پێچەوانەی شەریعەت بێت، هەم بەوە خوای گەورە رازی دەبێت و هەم بەندەکانیش رازی دەبوون بەو دادپەروەری و لێزانیەی، عومەر تا ساڵی ٩٣ کۆچی وەك والی مەدینە مایەوەو خزمەتێکی بێ وێنەی پێشکەش کرد.

عومەر یەکەمجار کە ئەو دە زانایایەی بانگ کرد تا ئەو کارەیان پێ بسپێرێت پێی وتن من بۆ کارێك بانگم کردون کە لەسەری پاداشت وەردەگرن‌و پێکەوە لەسەر حەق یارمەتی یەکتر دەدەین، ئەمەوێ چی بڕیارێك بدەم رای ئێوەی لەسەر بێت، ئەگەر

بینیتان کەسێك ستەمی لێ کرا یان کەسێکی ستەمکارتان بینی ئاگادارم بکەنەوە، ئەوانیش رازی بوون و نزای خێریان بۆ کرد لەسەر ئەو هەوڵە جوانەی.

عومەر لەو ماوەیەدا مزگەوتی پێغەمبەری(ﷺ) نوێ کردەوەو فراوانی کرد،

دوای ئەوەی وەلیدی خەلیفەی موسڵمانانو ئامۆزای عومەر مردو لە شوێنیدا سولەیمانی برای بوو بە خەلیفە کە ئەویش ئامۆزای عومەر بوو، خەلیفەی نوێ بڕیاری دا لەبەر چاکی و زانایی و بەهێزی عومەر و رازی بوونی خەڵك لێی عومەر بکات بە وەزیری خۆی.

سولەیمان هێندە متمانەی هەبوو بە نیازی پاكو زانایی عومەر کە بوو بە خەلیفە عومەری بانگ کرد و وتی تۆ دەزانیت من بوم بە خەلیفە و منیش زۆر شارەزا نیم و زانستم کەمە، جا تۆ چیت پێ باش بوو فەرمان بکە با وابێت و وا بکە، عومەریش هەموو شتەکانی راست دەکردەوەو خەلیفەش رازی بوو بە بڕیارەکانی.

عومەر هەمیشە دەیوت ئەگەر بۆ سەرخستنی ئایینی خواو پاراستنی لەسەر راستی و رێ نەدان بە تێکدانی ئیسلام پێویست بکات هەر جارەو پارچەیەك گۆشت لە لەشم بکەنەوە تا هەموو لەشم پارچە پارچە بکەن ئامادەم وام لێ بێت و هیچیش پێی دڵتەنگ نابم.

جارێك خەلیفە لەگەڵ عومەردا حەجیان دەکرد، خلیفە بە عومەری وت سەیری ئەو هەموو خەڵکە کە بەس خوا ئەزانێت ژمارەیان چەندە، عومەر پێی وت ئەوانە ئەمڕۆ لەژێر دەستی تۆدان، بەڵام سبەی لەرۆژی دواییدا هەموویان لە تاو خۆیان دەبن بە نەیارو نارازی لێت، خەلیفە کە ئەوەی بیرکەوتەوە دەستی کرد بە گریان.

عومەر زۆر جار بە خەلیفەی دەوت سەرم سوڕ دەمێنێ لە کەسێك کە خوا بناسێت کەچی لە فەرمانی خوا دەربچێت، شەیتان بناسێت کەچی بە گوێی بکات، دنیا بناسێت کەچی پشتی پێ ببەستێت.

دوای ئەوەی خەلیفە سولەیمان کۆچی دوایی کرد بڕیار درا بەیعەت بدرێت بە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، هەرچەندە خۆی حەزی نەدەکرد بەرپرسیارێتی وەربگرێت بەڵام خەڵکی بەیعەتیان پێدا، ئەویش پاش ئەوەی خەڵکی لە مزگەوت کۆبوونەوە وتارێکی پێشکەش کرد و باسی کرد کە ئەو کارەی ئەو سەختەو تاقیکردنەوەیە بۆیە با کەسێکی تر هەڵبژێرن، بەڵام خەڵکی هەموو هاواریان کرد ئێمە تۆمان دەوێت تا خەلیفە بیت، بۆیە ئەویش دواجار رازی بوو، ئینجا خەڵکەکەی هاندا بۆ لەخواترسان و چاکەکردن و دوورگرتن لە خراپەکاری.

عومەر ماندوو بوو وگەڕایەوە بۆماڵەوە، کوڕێکی هەبوو کە ناوی عەبدولمەلیك بوو، کە چوویەوە ویستی کەمێك رابکشێت، خێرا عەبدولمەلیکی کوڕی وتی بابە گیان ئەوە چی دەکەیت؟ وتی کوڕم تەواو ماندووم دەمەوێت کەمێك بحەسێمەوە، کوڕەکەی وتی دەتەوێت بخەویت پێش ئەوەی مافی رەوای خەڵك بگێڕیتەوە بۆیان و ئەو ستەمەی کراوە لای بەریت، خەڵکێکی زۆر چاوەڕێی تۆن تا سکاڵا بهێننە لای تۆ و تۆیش بچیت بە دوای مافیاندا، عومەر وتی کوڕم دەی من دوێنێ شەو هیچ نەخەوتوم و سەرقاڵی تەرمی سولەیمانی مامت بوم، با کەمێك بنوم دواتر چووم بۆ نوێژی نیوەڕۆ گوێ دەگرم لە کێشەی خەڵك، عەبدولمەلیکی کوڕی وتی جا دڵنیای تا نیوەڕۆ نامریت؟ عومەر خێرا هەستا و عەبدولمەلیکی کوڕی ماچ کرد و گوشی بە خۆیدا و وتی سوپاس بۆ خوا کە منداڵی وای پێ بەخشیوم لە ئایینداریدا هاوکارمە.

عومەر لە سەردەمی خیلافەتیدا زۆر دادپەروەر بوو و هەردەم دەچوو بە دەم کێشەی خەڵکەوە، نەیدەهێشت ستەمکاران بحەوێنەوەو ماف لێ دەسەندنەوە، پاڵپشتی هەژاران و ستەمکاران بوو، زانایانی کۆدەکردەوەو راوێژی پێ دەکردن و داوای دەکرد هەر ستەمێکیان بینی پێی بڵێن و ئاگاداری بکەنەوە تا هەموان پێکەوە ستەمەکە نەهێڵن، هەموو خۆشیەکانی یانی خۆی واز لێ هێنابوو بۆ ئەوەی بتوانێ خۆشی ببەخشێت بە خەڵکو ئاشتی و ئارامی وڵات بگرێتەوە، لە سەردەمی ئەودا خەڵکانێکی زۆری بێباوەڕ موسڵمان بوون.

ئیتر هێندە خەڵکی لە خۆشیو شادمانیدا بوون کە جارێکیان زەکاتیان هێنا عومەر فەرمانی کرد دابەش بکرێت بەسەر ئەو هەژارانەدا کە ماون، ئەوانیش وتیان ئەی سەرکردەی موسڵمانان هیچ هەژار نەماوە ئەوەی هەژار بوو هێندەی پێ بەخشراوە کە دەوڵەمەند بووە، عومەر وتی دەی بڕۆن بەو پارەیە ژن بهێنن بۆ گەنجان، وتیان ئەوەشمان کردووە، وتی دەی کێ قەرزارە بەو پارەیە قەرزەکەی بدەنەوە، وتیان ئەوەشمان کردووەو هێشتا پارە ماوەتەوە، وتی دەی سەیری ناموسڵمانەکان بکەن کامیان قەرزار بوو قەرزەکەی بدەنەوە، ئەوەشیان کرد هەر پارە مایەوە، وتی دەی بەخشش بدەن بە زانایان، ئەوەشیان کرد هەر مایەوە، ئەمجار فەرمانی کرد وتی بڕۆن دانەوێڵە بکڕنو بەسەر شاخەکاندا بڵاوی بکەنەوە تا باڵندەکانیش تێر بن.

جارێك عومەر زۆر حەزی لە سێو بوو، وتی خۆزگە سێوێکم هەبوایە، کەسێك هەستا و سێوێکی هێنا، عومەریش وتی دەی ئەو سێوە ببە بۆ فلانە کەس و سەلامی ئێمەی پێ بگەیەنە، کابرا وتی دەی خۆ پێغەمبەر(ﷺ) دیاری وەردەگرت، عومەر وتی ئەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دیاری بوو، بەڵام بۆ ئێمە ئەمڕۆ بەرتیلە، بۆیە نەیخوارد و خۆی پاراست لەو گومانەو ئەو حەزەی نەهێنایەدی.

رۆژانی هەیتی ئیمامی عومەر خۆی وتاری دەدا بۆ موسڵمانان، بۆ نوێژەکانی تریش خۆی بەرنوێژی دەکرد، کۆتا وتاریشی لە مزگەوتی ئومەوی پێشکەش کرد، لە وتارەکەیدا وتی ئێوە هەروا دروست نەکراون و هەرواش بەرەڵا نەکراون، بەڵکو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا تا خوای گەورە چاك و خراپ جیا بکاتەوە، قوڕ بەسەر ئەوەی لە رەحمەتی خوا دەربچێت... دەی بەندەکانی خوا لە خوا بترسن پێش ئەوەی بمرن، من کە ئەمە دەڵێم وا دەزانم کەستان هێندەی من تاوانبار نیە، بەڵام توبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای خوای گەورە.

ئەوە کۆتا وتاری ئیمامی عومەر بوو و دوای ئەوە نەخۆش کەوت تا ئەوەبوو دوای چەند رۆژێك لە ساڵی ١٠١ کۆچی لە دیمەشق وەفاتی کرد و تەرمەکەشی برایەوە بۆ یەکەم شوێنی دەسەڵاتی کە دیر سەمعان بوو.

# پەند و وانە

دەبێت هەمیشە حەز بە زانست و کاری چاکە بکەین، چونکە مرۆڤ بە زانست و بە کاری چاکە دەتوانێت خوای گەورە لە خۆی رازی بکات و سوودی زۆریش بگەیەنێت بە خەڵك، دەبینین خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەبەر ئەوەی هەم زانستی زۆری پێ بوو و هەم حەزی بە کاری چاکە دەکرد خۆشی و بەختەوەریەکی زۆری بەخشی بە موسڵمانان.

منداڵی ژیر و خواناس هەمیشە هەوڵ ددەات هاریکاری باوك و دایکی بێت و چاکەیان بیربخاتەوە، ئەوە خۆشەویستی نیە لەپێناو حەسانەوەیاندا کاری چاکیان بیرنەخەیتەوە، هەرچەندە خەلیفە عومەر زۆر ماندوو بوو بەڵام عەبدولمەلیکی کوڕی باوکی راچڵەکاند و تێی گەیاند هەرچەندە ماندووە بەڵام مادەم پۆستەکەی گەورەیە دەبێت بچێت بەدەم کاری خەڵکەوە نەوەك بمرێت و فریای کاری خەڵك نەکەوێت.

راوێژکردن بە زانایان کارێکی زۆر گرنگەو پێویستە لە هەر شتێکدا پرس و راوێژ بە زانایان بکەین، چونکە زانایان بەهۆی ئەو زانستەی پێیانە دەزانن باشترین و خراپترین شتەکان چین، بۆیە کاتێ رای ئەوان وەردەگرین چاکترین شت دەزانین و دەتوانین چاکترین کار جێ بەجێ بکەین.

مردن لەبەردەم هەمووماندایە و هەموان دەبێت بمرین، بۆیە دەبێت لەبیری نەکەین و خۆمان ئامادە بکەین بۆ دوای مردن، چونکە ژیانی دنیا کاتیە و شوێنی ئەوەیە چاکە کۆبکەینەوە بۆ رۆژی دوایی تا بەهەشت ببێتە شوێنی هەمیشەییمان، بەڵام زۆر کەس هەن وا دەژین وا دەزانن هەرگیز نامرن تا ئەوەی کتوپڕ مەرگ رێیان پێ دەگرێت و بێ هیچ چاکەیەك ئەم دنیایە جێ دەهێڵن.

کەسانی گەورە و خواناس هەمیشە ئامادەن لەپێناو ئایینی خوادا ماڵ و سامان و گیانی خۆیان بەخت بکەن، وەك دەبینین ئیمامی عومەر ئامادەبوو هەموو جەستەی پارچەپارچە بکەن بەس ئایینی خوا سەرکەوێت و لاری و تاوانەکان نەمێنن.

پێویستە خۆمان بپارێزین لە حەرامو لە هەموو شتێکدا بە گوێی ئارەزووەکانمان نەکەین، نەك وەك کەسانێك بین هەرچییان حەز لێ بوو بیکەن یان بیخۆن و گوێ نەدەن بە حەرام، بەڵکو هەرچیەك حەلاڵ نەبێت با زۆریش حەزی پێ بکەین دەبێت بە هیچ جۆرێك نزیکی نەکەوینەوە، وەك چۆن ئیمامی عومەر کاتێ گومانی هەبوو لەوەی ئەو سێوە بۆ ئەو حەڵاڵ بێت نەیخوارد و ناردی بۆ کەسێکی تر.

# پرسیارەکان

١. گرنگی شاری مەدینە چیە؟

٢. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز چی عومەری کوڕی خەتتابە؟ لە چیدا لەیەک دەچوون؟

٣. عومەر لە کوێ لەدایك بوو؟

٤. ژیانی منداڵی عومەر چۆن بوو؟

٥. باسی دەسەڵاتی عومەر بکە لە مەدینە.

٦. پەیوەندی نێوان عومەر و خەلیفە عەبدولمەلیك چۆن بوو؟

٧. عومەر داوای کرد لە کاربەدەستان ئەو سامانەی لە زەکات وەرگیرابوو چی لێ بکەن؟

٨. بەسەرهاتی عومەر و کوڕەکەی باس بکە کاتێ چوویەوە بۆ ماڵەوە.

٩. عومەر لە کۆتا وتاریدا چی وت بە موسڵمانان؟

١٠. ئەم چیرۆکە باس بکە بۆ خۆشەویست ترین کەسی خۆت.

# ئیمامی ئەحمەد

منداڵانی ئازیز و چاوگەش، ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت باسی بکەین ژیانی یەکێکە لەو زانا گەورانەی ئیسلام کە تا ئەمڕۆش بەشێکی زۆری موسڵمانانی جیهان بەپێی نووسین و فەتواکانی ئەو دەجووڵێنەوەو سوودی زۆریان وەرگرتووە لە زانستی پڕ سوودی ئەو زانایە، ئەویش هەموو زانستی خۆی لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وەرگرتووە، ئەوەشی لای زانایان و مامۆستاکانی وەرگرتووەو دواتر هەوڵی زیاتری داوەو زانیاری زیاتری پەیدا کردووەو توانیویەتی خزمەتێکی گەورە پێشکەش بە موسڵمانان بکات، ئەویش ئیمامی ئەحمەدە.

ئەم زانایە ناوی ئەحمەدەو باوکیشی ناوی موحەممەدە، دایکیشی ناوی صەفیەیە، بەڵام ئیمامی ئەحمەد کاتێ ناوی دەبرێ دەڵێن ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نەوەك بڵێن ئەحمەدی کوڕی موحەممەد.

پرسیار: بۆچی بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ناوی دەبەن لەکاتێکدا باوکی ناوی موحەممەد بووە؟

وەڵام: چونکە باوکی سەربازێکی موجاهیدی ڕێی خوا بووە و زۆر ناسراو نەبووە، بەڵام باپیری ناوی حەنبەل بووە کە دەسەڵاتدارێکی باوەڕداری ناسراو بووە، ئیتر بۆیە کاتێ ناوی ئیمامی ئەحمەد دەبرێت بە ناوی باپیریەوە ناوی دێنن نەك بە ناوی باوکیەوە.

ئەحمەد لە ساڵی ١٦١ کۆچی لە شاری بەغداد لەدایك بوو، کاتێ لە سکی دایکیدا بوو باوك و دایکی لە شاری مەروەوە کۆچیان کرد بۆ بەغداد، ئیتر ئیمامی ئەحمەد لەوێ لەدایك بوو، ئەمەش دەرفەتێکی باش بوو تا لەوێ گەورە زاناکانی ئیسلام بناسێت چونکە ئەو کات بەغداد پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو.

هەر لە تەمەنی منداڵیدا بوو کە باوکی کۆچی دوایی کرد، ئیتر ئەحمەد ژیانێکی هەتیوانەو بێ باوکی بەسەر برد و دایکی باوەڕداریشی هەوڵی دەدا قەرەبووی نەبوونی باوکی بکاتەوە بەوەی رۆڵی دایکێك و باوکێکیشی بۆ ببینێت، بۆیە ژیانی سەرەتاو منداڵی ئەحمەد پڕ لە نارەحەتی بوو.

بەڵام ئەوە نەبوویە بەربەرستی بەردەم ئەحمەد، بەڵکو ئەو زۆر حەزی دەکرد بە زانست، بۆیە خێرا چوویە خزمەت مامۆستایان‌و وانەی دەخوێند لەلایان، ئەوەبوو هەموو قورئانی پیرۆزی خوێند و لەبەری کرد، زانستێکی زۆری ئیسلامی خوێند، ئینجا ئیتر بەرەبەرە بڕیاریدا بنەوێتە لەبەرکردنی فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، بۆ ئەوە بەردەوام دەچوو بۆ لای مامۆستاکانی.

ئیمامی ئەحمەد بۆ وەرگرتنی فەرموودە شارە جیاجیاکانی عێراق گەڕا، هەروەها چوو بۆ یەمەن تا لەوێ لە مامۆستاکانی فەرموودەی ئەو وڵاتە فەرموودە وەربگرێت، هەروەها چوو بۆ مەککە، لەگەڵ ئەوەشدا چوو بۆ وڵاتی شام، بەڵێ ئەحمەد ئەو هەمووە شوێنانەی دەکرد تەنها بۆ ئەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ببیستێت و بیاننووسێتەوەو وەریان بگرێت، زۆرجار بەشێکی زۆری ئەو سەفەرانەی بە پیادە دەکرد، چونکە پارەی کەمی هەبوو و توانای ئەوەی نەبوو بە دڵی خۆی پارە خەرج بکات و بە ئیسراحەت بڕوات، ئەو دەیزانی ئیش کردن باشە، بەڵام بڕیاری دابوو لەبری ئەوەی ئیش بکات کاتەکەی بدات بە بواری فەرموودە تا بتوانێت ببێتە زانایەکی گەورە و لە داهاتوودا سودێکی زۆر بگەیەنێت بە موسڵمانان، بەوە هەم چاکە زیاد دەکات بۆ باوکی‌و دایکی لەبەر ئەوەی ئەوان وا بە موسڵمانی پەروەردەیان کردووە، هەم چاکەکە بۆ خۆیشی دەمێنێتەوە، هەم زانستەکەشی دەبێتە مایەی خێرو خۆشی و سوود بۆ خەڵکی تر، تەنانەت بۆ ئەوانەش کە دوای مردنی خۆی دێنە دنیا.

ئیمامی ئەحمەد هێندە حەزی هەبوو بە وەرگرتنی زانست کە بەیانی زۆر زوو خۆی ئامادە دەکرد و دەچوو بۆ لای مامۆستاکانی، ئیتر جاری وا هەبوو دایکی جلەکانی ئەحمەدی دەشاردەوە بۆ ئەوەی ئەوەندە زوو نەڕوات، بە ئەحمەدی دەوت کوڕی شیرینم پەلە مەکەن با مامۆستاکانت لەخەو هەستن ئینجا بڕۆ.

ئیمامی ئەحمەد خوێندکارێکی زیرەکی ئیمامی شافیعی بوو، ئیمامی شافیعیش ئەوی زۆر خۆش دەویست و ڕێزی دەگرت، تەنانەت هێندە خۆشی دەویست لە سەفەرێکی بۆ مەککەی پیرۆز لەگەڵ ئیمامی ئەحمەدو کەسێکی تر بە یەکەوە چوون.

ئیمامی شافیعی زۆر سەرسام بوو بە زانستی ئیمامی ئەحمەد هەرچەندە ئەحمەد خوێندکاری بوو، تەنانەت جارێك دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر نەیدیبوو داوای کرد لە ئەحمەدی خوێندکاری ئەگەر فەرموودەیەکی صەحیحی لای مامۆستایەك بەدی کرد پێی بڵێت تا ئەویش بچێت وەری بگرێت، واتە مامۆستاکەی پێی عەیب نەبوو زانستێ لە خوێندکارەکەیەوە فێر ببێت، چونکە ئەو کەسانە مەبەستیان ناوبانگو قسەی خەڵك نەبووە، بەڵکو ئەوەی لایان گرنگ بوو ڕەزامەندی خوای گەورە بوو، ئەوان مەبەستیان بوو سوود بگەیەنن بە خەڵك و بە پوختی زانستە دروستەکانیان بخەنە بەردەست.

ئیمامی شافیعی بڕیاریدا بچێت بۆ میصرو عێراق جێ بهێڵێت تا سوود بگەیەنێت بە خەڵکی میصریش، ئەوەبوو ئیمامی ئەحمەد بەڵێنی پێدا بچێت بۆ لای مامۆستاکەی لە میصر تا لەوێش زانستی لێ وەربگرێت، بەڵام هەر نەچوو.

پرسیار: بۆچی ئەحمەد بەڵێنی دا بچێت بۆ لای ئیمامی شافیعی کەچی نەچوو؟

وەڵام: چونکە پارەی نەبوو و نەیدەتوانی بڕوات، ئیتر لەبەر ئەوە نەچوو نەوەك لەبەر کەمتەرخەمی.

لەو ماوەدا کە ئەحمەد خوێندکار بوو سەربازانی موسڵمان نامەیان دەنووسی بۆ ژن و منداڵەکانیان، هەندێ لەو ژنانە نەخوێندەوار بوون، بۆیە داوایان دەکرد لە ئەحمەد تا

نامەكەیان بۆ بخوێنێتەوەو وەڵامی نامەكەیان بۆ بنووسێت، ئەویش سەری دادەنەواند تا گوناهبار نەبێت بە سەیركردنیان، هەرچیەكیشیان بوتایە كە شەرعی نەبوایە نەیدەنووسی بۆیان، چونكە ئەو ئەو كارەی لەبەر خوای گەورە دەكرد، بۆیە نەیدەهێشت شتێك بنووسن بۆ هاوسەرەكانیان كە خوای گەورە نارازی بێت پێی.

ئەحمەد هەرچەندە گەورە ببوو و وەك زانایەكی گەورەش سەیر دەكرا، بەڵام منداڵانی لەبیر نەدەكرد و جار هەبوو یاری دەكرد لەگەڵیاندا تا دڵیان خۆش بكات، ئەوەبوو جارێكیان نەعلەكانی گرت بە دەستیەوەو لەگەڵ منداڵەكان رای دەكرد و یاری دەكرد، یەكێك لە كەسە گەورەكان وتی ئەحمەد تا كەی واز ناهێنیت لە یاری كردن لەگەڵ منداڵان؟ ئەویش وتی تا ئەو رۆژەی دەمرم واز ناهێنم لە یاری كردن لەگەڵ منداڵان.

ئیمامی ئەحمەد هەرچەندە لە رووی ماددیەوە زۆر هەژار بوو بەڵام زۆر دەروونی بەرز بوو و هیچی لە كەس وەرنەدەگرت، ئەوەبوو جارێكیان گەنجێكی بانگ كرد و برێك پارەی پێدا تا هەندێ وەرەقەی بۆ بكرێت، گەنجەكەش وەرەقەكانی بۆ كڕی و دواتر حەزی كرد یارمەتی ئەو ئیمامە بدات چونكە هەموو كاتی خۆی داناوە بۆ زانست و خزمەتكردنی خەڵك، بۆیە برێك پارەی خستە ناو وەرەقەكان و بردیەوە بۆ ئیمامی ئەحمەدو خێرا چوو، كاتێ ئیمامی ئەحمەد وەرەقەكانی كردەوە بینی پارەیەكی تێدایە، خێرا پارەكەی هەڵگرت و پرسیاری كرد ماڵی ئەو كوڕە لە كوێیە، كاتێ پێیان وت لە كوێیە چوو بۆ ماڵیان و پارەكە و كاغەزەكانیشی پێدا و گەڕایەوە، هەرچەندە گەنجەكە وتی خۆ كاغەزەكانم بە پارەی خۆت كڕیوە كەچی ئیمامی ئەحمەد كاغەزەكانیشی وەرنەگرتەوە.

پرسیار: ئەی ئیمامی ئەحمەد بە چی دەژیا؟

وەڵام: ئیمامی ئەحمەد لەلایەن باوکیەوە خانوویەکی بۆ بەجێ مابوو، هەروەها کرێیەکی کەمی مانگانەشی بۆ بەجێ مابوو، جارجارەش دەچوو کرێکاری دەکرد، هەروەها جاری وا هەبوو ناچار دەبوو لە هەندێ کەس قەرز بکات بەلام زۆر کەم قەرزی دەکرد، جاری وایش هەبوو کە کەسێك کشتوکاڵەکەی خۆی دەچنیەوەو ئینجا بەرەلای دەکرد، ئیمامی ئەحمەد دەچوو مۆڵەتی وەردەگرت و ئەو پاشماوەی لەوێ بەجێ دەما کۆی دەکردەوە بۆ خۆی.

ئیمامی ئەحمەد لە تەمەنی چل ساڵیدا ژنی هێنا، خوای گەورەش منداڵێکی زیرەکی پێ بەخشین کە ناوی عەبدولاّ بوو، ئەو منداڵەشی شوێن پێی باوکی هەڵگرت و فەرموودەی وەردەگرت و بەردەوام لای باوکیشی وانەی دەخوێند و برێك فەرموودەی لە باوکیەوە گێڕاوەتەوە.

ئیمامی ئەحمەد تووشی تاقیکردنەوەیەکی خوایی بوو، ئەویش ئەوەبوو دەسەلاّتداری ئەو کاتەی موسڵمانان وا تێگەیەنرا بوو کە قورئانی پیرۆز دروستکراوی خوایە، بۆیە دەیوت دەبێت ئیمامی ئەحمەدیش وابڵێت، بەلام ئەو رازی نەبوو ئەوە بڵێت و دەیوت قورئان فەرمایشتی خوای گەورەیە، لەسەر ئەوە بەند کرا، ئەوەبوو ئازارێکی زۆر درا، بەلاّم ئیمامی ئەحمەد خۆڕاگر بوو و راکەی خۆی نەگۆڕی، ئامادەش نەبوو بە موسڵمانان بڵێت دژی سەرکردەی موسڵمانان راپەڕن بۆ ئەوەی فیتنەو ئاژاوە نەکەوێتە ناو وڵاتی موسڵمانانەوە، بەلاّم دواجار ئازاد کرا.

پاش ماوەیەك ئیمامی ئەحمەد لە ساڵی ٢٤١ کۆچیدا تووشی نەخۆشی بوو و تایەکی زۆری هەبوو، ئیتر خەڵکی دەهاتن بۆ سەردانی، تەنانەت ئەوانەش ئازاریان دابوو دەهاتن داوای گەردن ئازادیان لێ دەکرد، تا ئەوەی رۆژی مردنی هات.

عەبدوڵای کوڕی لای بوو، بیستی باوکی دەیوت جارێ نا، وتی باوکە گیان ئەوە چی دەڵێیت؟ وتی کوڕم ئەوە شەیتانە دەڵێت ئەحمەد تۆم لەدەست دەرچوو نەمتوانی لەخشتەت بەرم، منیش وتم نا جارێ تا نەمرم رزگارم نابێت لە دەست پیلانی تۆ.

دواجار ئیمامی ئەحمەد بە باوەرداری گەڕایەوە بۆ لای پەیوەردگاری و کۆچی دوایی کرد و موسڵمانانیش تەواو دڵگرانی دایگرتن و خەڵکێکی زۆر زۆر نوێژیان کرد لەسەر تەرمەکەی بە جۆرێ تا ئەو کاتە شتی وا نەبینرابوو، ئەو رۆژەش کە وەفاتی کرد رۆژی هەینی بوو، لە بەغداد خرایە ناو گۆڕ و زیاتر لە یەك ملیۆن کەس ئامادە بوون.

## پەندو وانە

نەبوونی باوك یان دایك شتێکی ناخۆش و ئازاربەخشە، بەڵام ئەوە نابێتە بەربەست بۆ ژیان و دەبێت بەوە چۆك دانەدەین بەڵکو کارێك بکەین ببێتە مایەی خێر بۆ ئەوانیش و بەردەوام نزایان بۆ بکەین، چونکە دەبینی پێغەمبەر(ﷺ) هەر بە منداڵی دایك وباوکی لەدەست داوە، بەڵام خۆڕاگر بووە تا خوای گەورە خێری هێناوەتە ڕێی، هەروەها دەبینین ئیمامی ئەحمەد بە منداڵی باوکی مردووە،بەڵام هەوڵیداوە تا بووە بەو زانا گەورەیە، بەوەش چاکەی زۆر چووە بەهۆی منداڵەکەیەوە.

هەوڵدان بۆ زانست هەنگاوێکی زۆر گەورە و پڕ شانازیە و هەرگیز مرۆڤ لێی پەشیمان نابێت، چونکە هەم خوا پێی ناخۆشە و هەم هەمو دروستکراوەکانی تری خوای گەورە نزای خێر دەکەن بۆ ئەو کەسە، هەم لای بەندەکانی خواش خۆشەویست دەبێت و خەڵکیش بە ڕێز و گەورەییەوە سەیری دەکەن، مرۆڤی زانا هەمیشە دەبێتە مایەی خێر بۆ دەوروبەرەکەی.

دەبێت خوێندکار زۆر ڕێزی مامۆستای بگرێت و بە چاوی گەورەییەوە سەیری بکات چونکە مامۆستاکەی زانستی پێ بەخشیوە کە ئەوەش چاکترین شتێکە کەسێك ببیەخشێت بە کەسێك، بۆیە دەبێت نرخی بزانێت و لەبەرچاوی بێت ئەو مامۆستایە ئەوەندە ئەوی خۆش ویستووە حەزی کردووە چی دەزانێت بە ئەویشی بڵێت و ئەویش فێر بکات.

ئەگەر خوێندکارێك شتێکی باشی زانی با بە ڕێزەوە بە مامۆستاکەی بڵێت و ئەوە هیچ عەیب نیە وەك چۆن ئیمامی شافیعی داوای کرد لە خوێندکارەکەی خۆی ئیمامی

ئەحمەد تا ئەگەر فەرموودەیەکی صەحیحی زانی لای کەسێکە پێی بڵێت تا بچێت بۆی ئەگەر تەنانە لە وڵاتانی دووریش بێت.

دەبێت هەمیشە وریای ئاشتی و خۆشی موسڵمانان بین و خۆمان بپارێزین لە فیتنەو ئاژاوە نانەوە وەك چۆن ئیمامی ئەحمەد هەرچەندە بەندیش کرابوو کەچی نەیدەهێشت بەهۆی ئەوەوە موسڵمانان کێشە بکەوێتە نێوانیانەوە.

## پرسیارەکان

١. بۆچی ئیمامی ئەحمەد بە کوڕی حەنبەل ناسراوە؟

٢. ئیمامی ئەحمەد لە ساڵی چەند و لە کوێ لەدایك بوو؟ ئەی لەساڵی چەند وەفاتی کرد؟

٣. پەیوەندی نێوان ئیمامی ئەحمەد و ئیمامی شافیعی چۆن بوو؟

٤. بۆچی ئیمامی ئەحمەد بەڵێنەکەی خۆی لەگەڵ ئیمامی شافیعی نەبردە سەر کە بەڵێنی دابوو بچێت بۆ میصر بۆ لای؟

٥. بۆچی ئیمامی ئەحمەد خرایە بەندیخانەوە؟

٦. شەیتان لە کاتی مردنی ئیمامی ئەحمەددا چی پێ وت؟ ئیمامی ئەحمەد چۆن وەڵامی دایەوە؟

٧. ئەم چیرۆکە باس بکە بۆ یەکێك لە خۆشەویستەکانت.

# ئیبن مەندە

لە وڵاتی ئێراندا شارێکی جوان و ڕازاوە هەبوو، شاری باوەڕداران و زانایانی ئیسلام، شارێك بەردەوام زانای پێ دەگەیاند تا خزمەتی پەیامی خوا بکەن، ئەویش بریتی بوو لە ئەصفەهان.

ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر کە نزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەر دەکات بنەماڵەیەك لەو شارەدا دەژیان کە ناسرابوون بە بنەماڵەی ئیبن مەندە، بنەماڵەیەك بوون زۆر باوەڕدار و زانا بوون، هەموویان تەمەن و ژیانی خۆیان سەرقاڵ دەکرد بە زانستی فەرموودەوەو لای زانایانی خۆیان و دەرەوەش فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایان دەبیست و وەریان دەگرت و دەیاننوسیەوەو دەیانوتنەوە بۆ خەڵکی تا ڕاستیەکانیان تێ بگەیەنن.

یەکێك لە زاناکانی ئەو بنەماڵەیە ناوی ئیسحاق بوو، ئیسحاق برایەکیشی هەبوو کە زۆر زانا بوو و وانەی دەوتەوە بە خەڵك.

ئیسحاق زانای ناسراوی بواری فەرموودە بوو، کە گەیشتە کاتی خۆی ژنی هێنا و خوای گەورەش پاش ماوەیەك منداڵێکی جوان و زیرەکی پێ بەخشین.

پرسیار: ئەو منداڵە کەی لەدایك بوو؟

وەڵام: ئەو منداڵە لە ساڵی ٣١٠ کۆچی لەدایك بوو.

پرسیار: ئەو منداڵە ناوی چی بوو؟

وەڵام: ئەو منداڵە ناوی موحەممەد بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دواتر زۆر زیرەك و زانا دەرچوو هەر بە ناوی بنەماڵەکەیەوە ناسراوەو خەڵکی کە ناوی دەبەن پێی دەڵێن ئیبن مەندە.

دایك و باوکی هەر لە منداڵیەوە کەوتنە نازکێشان و پەروەردەکردنی ئەم منداڵەیان، وەك چۆن دایکی شیری پێ دەدا باوکیشی زانستی پێ دەبەخشی، ئیتر بوو بە منداڵێکی زیرەك و شارەزا.

ئیبن مەندە تەمەنی هەشت ساڵ بوو کە فەرموودەی لە باوکی وەرگرت و کەوتە گەڕانی ورد بە دوای زانستدا، ئیتر ڕۆژانە دەچوو لای باوکی وانەی دەخوێند، دواتر دەچوو بۆ لای مامیشی کە ئەویش زانایەکی گەورە بوو وانەی دەخوێند، دواتریش فەرموودەکانی بە لەبەرکردنەوە دەوتەوە تا لەبیری نەچنەوە.

لەبەر ئەوەی باوکی زانایەکی ناسراو بوو بۆیە زۆربەی زاناکانی شارەکە تێکەڵییان دەکرد، ئەمە دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئیبن مەندە تا ئەو زانایانە بناسێت و زانستیان لێ وەربگرێت، هەر بۆیە باوکی داوای کرد لەو زانایانە تا وانە بڵێنەوە بە کوڕەکەی، ئەوانیش ڕازی بوو.

ئیتر ئیبن مەندە ڕۆژانە دەچوو بۆ لای ئەو زانایانەو فەرموودەی لەوان دەبیست و زانستی تریشی وەردەگرت، خوێندکارێکی زیرەك بوو، پێویستی نەدەکرد مامۆستاکانی بە زۆر بیبەنەوە بۆ وانەخوێندن، بەڵکو خۆی بە خۆشحاڵییەوە ڕۆژانە خۆی ئامادە دەکرد و دەچوو وانەکەی دەخوێند، چونکە ئەویش ئاواتی ئەوە بوو ببێتە زانایەکی گەورە و خەڵکی فێری چاکەکاری بکات و کێشەی خەڵك چارەسەر بکات و منداڵان و گەنجانی دەوری خۆی پێ بگەیەنێت.

دوای ماوەیەك کە زانستی چاکی لە مامۆستاکانی وەرگرت، ئیبن مەندە بڕیاری دا بچێتە دەرەوەی وڵاتی خۆی تا زانست لەوانیش وەربگرێت، کۆڵ و باری بچووکی خۆی پێچایەوەو کەوتە ڕێ بۆ دەرەوەی وڵاتان، ئیتر هێندە گەڕا تا نزیکەی هەزارو حەوت سەد مامۆستای بینی و لە خزمەتیاندا وانەی خوێند، لەو ماوەدا ئیبن مەندە بۆ وەرگرتنی زانست هەر یەك لەم شوێنانەی کرد:

(ئەسکەندەریە، تەرابلوس، بوخارا، بەغداد، بيت المقدس، بەیرووت، بیکەند، تننیس، حیمص، دیمەشق، صەیدا، تووس، غەززە، قولزوم، قیساریە، کووفە، مەرو، میصر، مەککە، نەیسابوور، هەمەدان).

ئیبن مەندە کە کاتی خۆی هات ژنی هێنا، ناوی ژنەکەشی بریتی بوو لە ئەسما، ئەویش ئافرەتێکی خواناس و شارەزا بوو، خوای گەورەش چوار منداڵی بەخشی بەو خێزانە، هەرچوار منداڵەکەشی زانا و کەسی هەڵکەوتە دەرچوون و شوێن پێی باوکی خۆیان گرتەبەر لە وەرگرتنی زانستدا، دواتر کە ئەوانیش منداڵیان بوو هەر وەك باوکیان کەوتنە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان و هەموو منداڵەکانیان بۆ دوارۆژ بوون بە زانای گەورە، واتە بنەماڵەکەیان هەموویان وا پەروەردە دەکران دەبوون بە زانای گەورە و خواناس.

پرسیار: ناوی منداڵەکانی چی بوون؟

وەڵام: ناوی منداڵەکانی بریتی بوون لە(عەبدورەحمان، عەبدولوەهاب، عوبەیدوڵا، عەبدورەحیم).

ئیبن مەندە هێندە زانایەکی گەورە دەرچوو کە زاناکانی تر زۆر سەرسام بوون پێی، دەبینین ئیبراهیمی ئەصفەهانی کە مامۆستایەکی ئیبن مەندە بوو باسی ئیبن مەندەی دەکردو دەیوت (کەسی وەك ئیبن مەندەم نەدیوە).

هەروەها ئەبوو ئیسماعیلی ئەنصاری کە زانایەکی گەورە بوو سەبارەت بە ئیبن مەندە دەیوت (ئیبن مەندە گەورەی کەسانی سەردەمی خۆی بووە).

ئیبن مەندە هەمیشە موسڵمانانی ئاگادار دەکردەوە لە هەڵەی خەڵکی گومڕا و نەزان و راستیەکانی روون دەکردەوە، ئەوانەی بە ئارەزووی خۆیان باسی ئیسلامیان دەکرد بەردەوام لە لایەن ئیبن مەندەوە وەڵامیان دەدرایەوەو هەڵە و پیلانی پیسیان لەناو دەبرا.

ئیبن مەندە چەندین کتێبی نووسی سەبارەت بە ئایینی ئیسلام و بۆ خزمەتکردنی موسڵمانان، هەندێکیان روونکردنەوەی یەکخواپەرستییان تێدا بوو، هەندێکیان وەڵامی ناراستیەکانی خەڵکی گومڕایان تێدا بوو، یەکێك لە کتێبە دیارەکانیشی تایبەت بوو بە

باسی ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەو دەیزانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) گەورەترین کەسانو مامۆستا بون کە بەوپەڕی دڵسۆزیەوە ئایینی ئیسلامیان گەیاندووە بە مرۆڤایەتی، بۆیە دەیویست ژیانی هاوەڵان بە هەموان بگەیەنێت.

پرسیار: ناوی کتێبەکەی ئیبن مەندە چی بوو کە لەسەر هاوەڵان نووسیبووی؟

وەڵام: ناوی ئەو کتێبەی نابوو (مەعریفەتو صەحابە) واتە ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ).

بەرەبەرە ئیبن مەندە پیر بوو تا ئەوەی کاتی ئەوە هات خوای گەورە بیگەڕێنێتەوە بۆ لای خاوی، واتە ئیتر دەبوو دنیا جێ بهێڵێ و بمرێت، ئەوەبوو لە تەمەنی ٨٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

# پەند و وانە

- دەبێت هەمیشە بە دوای زانستدا بگەڕێین و هەوڵ بدەین مامۆستای شارەزا پەیدا بکەین و داوایان لێ بکەین تا زانستمان پێ ببەخشن تا ئێمەش ببینە زانا و خزمەت بکەین بە خەڵك.
- لە ناو ئیسلامدا هەموو نەتەوەکان جێیان ئەبێتەوەو قبووڵ کراون، ئیتر لەخواترسان بەپێی رەنگ و نەتەوە نیە، بەڵکو ئەوەی بنەڕەتە لە ئیسلامدا لەخوا ترسان وپەیرەوی جوانتری پەیامی ئیسلامە، بۆیە هیچ کات ئیسلام جیاوازی ناکات لەنێوان کورد و عەرەب و تورك و فارس و ئینگلیز و هەر نەتەوەیەکی تردا، بەڵکو جیاوازیەکە لەسەر ئەوەیە کامیان کاری چاکە زیاتر بکات.
- پێویستە زۆر خۆمان سەرقاڵ بکەین بە ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) و پەند و وانە لە ژیانیان وەربگرین و باسیشی بکەین بۆ دەوروبەرمان.
- دەبێتە هەر کەس هەڵەی کرد بە دڵسۆزیو ژیرانە هەڵەکەی بۆ راست بکەینەوە بە جۆرێك کە نەبێتە هۆکاری ئابڕووبردنی، بەڵام ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر هەڵەکەی دەبێت چواردەورمان ئاگادار بکەینەوە لەو هەڵەی تا پێی هەڵنەخەڵەتێن.

## پرسیارەكان

١. ئیبن مەندە ناوی چی بوو؟ ئەی بۆچی پێی دەوترا ئیبن مەندە؟

٢. ئیبن مەندە لە ساڵی چەند لە دایك بوو؟ ئەی لە تەمەنی چەند ساڵیدا فەرمودەی وەرگرت؟

٣. دەتوانیت ناوی چەند شوێنێ بڵێی كە ئیبن مەندە چوو بۆیان تا زانست وەربگرێت؟

٤. كتێبی (مەعریفەتوصەحابە)ی ئیبن مەندە باسی چی دەكرد؟

٥. ئیبن مەندە لە تەمەنی چەند ساڵیدا كۆچی دوایی كرد؟

٦. دەتوانیت ژیانی ئیبن مەندە بۆ یەكێك لە خۆشەویستەكانت باس بكەیت؟

٧. گرنگترین شتێك لە ژیانی ئەم زانایە فێر بوویت چی بوو؟

# صەلاحەدینی ئەیووبی

ئازیزانم، ئەم کەسایەتی و هەڵکەوتەی ئەمجار باسی دەکەین زانایەك نیە کە بە کتێب و نووسین خزمەتی کردبێت، مامۆستایەك نیە کە بە وتاردان و وانە وتنەوە نەوەیەکی پێ گەیاند بێت، بەڵکو سەرکردەیەکی موسڵمانی کوردە کە بە توانا و شمشێری دەستی و بیری وردی سیاسی توانی خزمەتی باڵا پێشکەش بکات بە موسڵمانان، خزمەتێك کە وایکرد لەگەڵ ئەوەی ناوی ببریێ هەموان بیناسن، تەنانەت هێندە خزمەتەکەی گەورە بوو کە بوویە مایەی ناساندنی کورد و هەرکات ناوی ئەو بێت خێرا ناوی کورد دێت، یان کاتێ کەسێکی کورد خۆی دەناسێنێت بە رەگەزێکی تر خێرا ناوی ئەم سەرکردەیەی بۆ دێننەوە، ئەویش سەرکردەی ئیسلام صەلاحەدینی ئەییووبیە.

ئەم سەرکردە گەورەی ئیسلام کورد بووە، ناوی یووسفە، لە بنەماڵەی ئەیووبیەکانە، ئەیووبیەکان بنەماڵەیەکی کوردی موسڵمان بوون کە کەسایەتی و سەرکردەی زۆر گەورەیان تێدا دەرکەوت، ماوەیەکی زۆریش دەسەڵاتی بەشێکی زۆری جیهانی ئیسلامییان بەدەستەوە بوو و وەك قەڵای ئاسنین بەریان دەگرت بە هێرشی دوژمنانی ئیسلام.

لە ناو ئەم بنەماڵەدا کوڕێکی جوان و زیتەڵێ دەرکەوت کە ناوی یووسف بوو، باوکی ناسرابوو بە نەجمەدین و ناوی ئەیووب بوو، یووسف لە ساڵی ٥٣٢ کۆچیدا لەدایك بوو، لەو کاتەدا کە جیهانی ئیسلامی بەدەست چەندین کێشەوە دەیناڵاند، لەلایەکەوە لە ناو وڵاتدا خراپەکاران هەبوون کە دەیانویست موسڵمانان لەناو بەرن، لەلایەکی تریشەوە لە دەرەوەی موسڵمانان ناموسڵمانەکان هێرشیان دەهێنا تا خاکی موسڵمانان داگیر بکەن.

باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە كە ناوی شادی بوو كەسایەتیەكی زۆر گەورە و بەهێز بوو، بۆیە سەركردەی موسڵمانە توركەكان (سەلجووقیەكان) پاراستن‌و بەرپرسیارێتی قەڵایەكی دا بە دەست شادیەوە كە ئەویش قەڵای تكریت بوو، صەلاحەدین لەو قەڵایەدا لەدایك بوو.

مامی صەلاحەدین كە ناوی شێركۆ بوو ئەویش سەركردەیەكی دیاری سەربازی و جەنگاوەرێكی رێی خوا بوو، كەسێكی زۆر بەهێز بوو.

بەڵام كاتێ صەلاحەدین لەدایك بوو بڕیاردرا باوكی صەلاحەدین و مامیشی قەڵای تكریت جێ بهێڵن.

پرسیار: بۆچی بڕیار درا ئەو دوو برایە قەڵاكە جێ بهێڵن؟

وەڵام: چونكە پیاو خراپێك هەبوو كە ویستبووی دەستدرێژی بكاتە سەر ئافرەتێك، ئافرەتەكەش داوای كردبوو لە شێركۆ فریای بكەوێت، ئەویش چوو بوو و پیاوەكەی كوشتبوو، بۆیە بڕیاردرا لەبەر ئەوەی كوشتویەتی قەڵاكە جێ بهێڵن.

ئیتر ئەوانیش كۆچیان كرد و چوون بۆ موصڵ، سەركردەی موسڵمانان لە موصل ناوی عیمادەدین زەنگی بوو، واتە بنەماڵەی ئەوان زەنگیەكان بوون كە ئەوانیش خزمەتێكی زۆر گەورەیان پێشكەش كرد بە موسڵمانان كاتێ زۆر بە بەهێزی بەرگرییان دەكرد لە خاكی موسڵمانان و نەیاندەهێشت بێباوەران خاكی موسڵمانان داگیر بكەن.

كاتی خۆی عیمادەدین كە لە جەنگێكدا شكستی خواردبوو باوكی صەلاحەدین ئەوی پەنا دابوو و یارمەتی دابوو و خزمەتی كردبوو و دواتریش رزگاری كردبوو، بۆیە كاتێ باوكی صەلاحەدین و خێزانەكەی چوون بۆ موصل عیمادەدین ئەو چاكەی لەبەر چاو بوو و رێزی زۆری گرتن و زەوی زۆری پێدان.

دواتر عیمادەدین شارێكی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی بە ناوی بەعلەبەگ، خێرا باوكی صەلاحەدینی كرد بە بەرپرسی ئەو شارە، ئیتر صەلاحەدین تەمەنی منداڵی

خۆی لەوێ بەسەر دەبرد، لەوێ باوکی هەوڵی دا صەلاحەدین پێ بگەیەنێت، بۆیە لەلایەکەوە دەینارد بۆ لای مامۆستا و زاناکان تا زانستە ئیسلامیەکان فێر ببێت، لەلایەکی ترەوە هونەری جەنگی و سەربازی فێر دەکرد تا وەك موجاهیدێکی ڕێی خوا بتوانێت خزمەت بکات بە ئیسلام، صەلاحەدینیش هەوڵی خۆی دا تا بە تەواوەتی هەڵکەوت و بوو بە سەرکردەیەکی بەهێز.

صەلاحەدین تەمەنی نزیکەی بیست و حەوت ساڵ بوو کە وەك نێردراوی عیمادەدین لەگەڵ شێرکۆی مامیدا بە سوپایەکەوە چوو بەرەو میصر.

پرسیار: بۆچی چوون بۆ موصل؟

وەڵام: چونکە سەرکردەی دەوڵەتی شیعەکان داوای لە عیمادەدین کرد یارمەتی بدات دژ بە سەرکردەیەکی خۆیان لە بەرامبەردا هەندێ لە خاکی میصری دەداتە دەست، ئەویش رازی بوو و ئەوەی کرد بۆ ئەوەی میصر بگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی سوننەکان.

صەلاحەدین لەو سوپایەدا ڕۆڵێکی بەرچاو و گەورەی بینی، دوای سێ ساڵی تر جارێکی تر صەلاحەدین چوویەوە بۆ میصر بۆ یارمەتی سەرکردەی شیعەکان دژ بە سەرکردەیەکی تری شیعە کە خاکی موسڵمانانی دەفرۆشت بە ناموسڵمانەکان، ئەو سرکردەش ناوی شاور بوو، صەلاحەدین چوو و توانی ئەو سەرکردە ناپاکە بکوژێت.

دوای ئەم کارە شێرکۆی مامی کرا بە وەزیری فاتیمیەکان(شیعەکانی ناو میصر)، بەڵام هێندەی نەبرد شێرکۆ لابراو لە شوێنیدا صەلاحەدین دانرا، بەرەبەرە صەلاحەدین هەوڵیدا بێ ئەوەی خوێن بڕژێت دەوڵەتی شیعەکان نەهێڵێت و لە شوێنیدا دەوڵەتی سوننی دابمەزرێنێت چونکە زۆربەی خەڵکی میصر و بەڵکو موسڵمانانی جیهانیش سوننە مەزهەب بوون، توانی لە ماوەیەکی کەمدا ئەو دەوڵەتە نەهێڵێ و لە شوێنیدا دەوڵەتی ئەیووبی دابمەزرێنێت.

ئیتر لێرە بە دواوە صەلاحەدین هەموو هەوڵی بۆ ئەوە بوو هێرشی ناموسڵمانە خاچپەرستەکان بۆ داگیرکردنی خاکی موسڵمانان لەناو بەرێت.

پرسیار: خاچپەرستەکان کێ بون؟

وەڵام: خاچپەرستەکان ئەو سوپا مەسیحیە بوون کە دەهاتن بۆ داگیرکردنی خاکی موسڵمانان، بەڵام لەلایەن چەند سەرکردەیەکی موسڵمانانەوە لەناو بران، وەك سەرکردە نورەدین و عیمادەدین و صەلاحەدین و بیبرس و کەسانی تر، لەو مەیدانەشدا صەلاحەدینی ئەیووبی رۆڵی زۆر بەرچاوی بینیو توانی قودس لە دەستی ئەو خاچپەرستانە وەربگرێتەوەو موسڵمانان دڵخۆش بکات و ببێتە شانازیەکی گەورەش بۆ گەلەکەی خۆی، ئەمەش لە ساڵی ٥٨٣ کۆچیدا بوو، ئەو کات صەلاحەدین تەمەنی ٥١ ساڵ بوو، کاتێ جەنگێکی سەخت روویدا کە ناسراوە بە جەنگی حەتین، تیایدا پاش جەنگێکی قورس سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتی صەلاحەدین سەرکەوت و توانی قودس رزگار بکات.

صەلاحەدین کە قودسی رزگار کرد رێی نەدا کوشت و بڕی ناموسڵمانەکان بکرێت، بەڵکو رێزی گرتن و گیانی پاراستن و سامانی نەبردن، سەربەستی کردن ئایا دەچن بۆ وڵاتی سوپا مەسیحیەکان یان لەناو موسڵماناندا بمێننەوە، چونکە ئەوە سیفەتی موسڵمانە کە حەز ناکات بە ناهەق خوێن برژێت و رێزی هەموو کەس دەگرێت تەنانەت ئەوانەش کە دژی بوون، بۆیە ئەو رێزو گەورەییەی صەلاحەدین وای کرد سەرکردە ناموسڵمانەکان و خەڵکی ناموسڵمانی تریش تەواو پێی سەرسام بن و بە رێزەوە ناوی ببەن.

هەروەها صەلاحەدین هەموو پەرستگاکانی مەسیحیەکانی پاراست و رێی نەدا سوپای موسڵمانان ئەو پەرستگایانە برووخێنن، هەرچەندە موسڵمانەکان حەزیان دەکرد بیرووخێنن چونکە پێشتر ئەوان مزگەوتی موسڵمانانیان دەرووخاند و ژنو

منداڵ‌و گەورەو بچووکی موسڵمانانیان سەردەبڕی، بەڵام صەلاحەدین تێیگەیاندن کە ئەوان نابێت وا بکەن چونکە موسڵمان بە خراپە وەڵامی خراپە ناداتەوە.

صەلاحەدین تەواو حەزی بە جیهاد دەکرد و هەمیشە حەزی دەکرد لەرێی خوادا بجەنگێت و خاکی موسڵمانان ئازاد بکات و ئاینی ئیسلام بگەیەنێت بەو شوێنانەش کە پێیان نەگەیشتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر حەزی دەکرد تێکەڵی زانایان بێت و داوای دەکرد زانایان کتێبی بۆ بنووسن تا بیخوێنێتەوە بۆ ئەوەی نەکەوێتە هەڵەوە، تەنانەت هەر کەس کتێبێکی بەهێزی بۆ بنووسیایە لە خۆی نزیکی دەکردەوە.

ئەم سەرکردە خۆشەویستە چاکەکارە بەو جۆرە بەردەوام بوو لە خزمەتکردنی ئیسلام‌و موسڵماناندا‌و لای موسڵمانان‌و هاوڵاتیانی وڵاتەکەشی زۆر ئازیز و خۆشەویست بوو، زانایان زۆر رێزیان دەگرت و نزای خێریان بۆ دەکرد، بەو جۆرە ژیا تا رۆژی وەفاتی هات و لە تەمەنی ٥٧ ساڵیدا و لە ساڵی ٥٩٨ کۆچیدا کۆچی دوایی کرد و پاش نوێژ کردن لەسەر تەرمەکەی لە دیمەشق ئەسپەردەکرا، تا ئێستاش گۆڕەکەی زانراوەو لە دیمەشق ماوەتەوە.

## پەندو وانە

موسڵمان دەبێت وەفای هەبێت بەرامبەر بەو کەسانەی کە چاکەیان هەبووە لەگەڵیدا چونکە وەفاداری سیفەتی پێغەمبەران بووە، دەبینین چۆن عیمادەدین وەفای هەبووە بەرامبەر بە باوکی صەلاحەدین لەبەر ئەوەی لە رابردوودا چاکەیەکی بەرامبەر ئەنجام داوە.

جیهاد کردن و هەوڵ دان بۆ رزگارکردنی خاکی موسڵمانان لای خوای گەورە زۆر وەرگیراو و کاری جوانەو خوای گەورە پاداشتی زۆر گەورەی داناوە بۆ ئەو کەسانە، صەلاحەدینی ئەیوبیش نموونەیەکی باڵا بووە لەو بوارەدا کە توانی قودسی خۆشەویست بگێڕێتەوە بۆ موسڵمانان.

دەبێت موسڵمان لەبەر ستەمی کەسانی خراپ نەکەوێتە ستەم کردن بەڵکو موسڵمان هیچ کات بە خراپە وەڵامی خراپە ناداتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە چەند ستەمی لێ کرا کەچی کاتێ مەککەی رزگار کرد لێیان خۆش بوو و تۆڵەی نەکردەوە لەوانەی کە ستەمیان لێ کردبوو، صەلاحەدینیش شوێن سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) کەوت و کاتێ قودسی رزگار کرد ستەمی نەکرد لە ناموسڵمانەکان.

دەبێت ئێمە هەم وەک موسڵمان و هەم وەک کورد شانازی بکەین بە صەلاحەدینەوە کە سەرکردەیەکی وابووە دوژمنەکانیشی بە سەرسامی و رێزەوە باسیان کردووە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە موسڵمانی کورد خزمەتی پێشکەش کردووەو ئیسلام مایەی خێر بووە بۆ کوردو کوردیش بە جوانی ئیسلامی وەرگرتووە.

# پرسیارەکان

١- صەلاحەدین ناوی چی بوو؟ لە کوێ و لە ساڵی چەند لەدایك بوو؟

٢- بۆچی ماڵی صەلاحەدین کۆچیان کرد بۆ موصل؟

٣- صەلاحەدین کە چوو بۆ میصر چی کرد؟

٤- جەنگی حەتین چی بوو؟

٥- باسی هەڵوێستی صەلاحەین بکە کاتێ قودسی رزگار کرد.

٦- ئایا لە دڵەوە صەلاحەدینت خۆش دەوێت؟

٧- ژیانی ئەم سەرکردەیە باس بکە بۆ یەکێك لە هاوڕێ ئازیزەکانت، دواتر پرسیاری لێ بکە بزانە چی پەندو ئامۆژگاریەکی لێ فێر دەبێت.

# ئیمامی نەوەوی

ئەم جارە ئەو کەسەی کە باسی دەکەین زانایەکی دیار و گەورەی موسڵمانانە کە موسڵمانان تا ئەمڕۆش سەرقاڵن بە خوێندنەوەی نووسینەکانی، ئەم کەسە خوێندکاری ئیمامی شافیعی بووە، بۆیە کوردستانی ئێمەش کە سەر بە مەزهەبی ئیمامی شافیعیە زۆر گرنگی دەدەن بە نووسینەکانی، ئەویش ئیمامی (نەوەوی)یە.

بەڵێ، وڵاتی شام کە سووریا بەشێکە لەو وڵاتە، لانەو مەڵبەندی پێغەمبەران بووە، دوای ئەوەش سەدان زانای گەورەی لێ دەرکەوتووە، ئەو زانایانە بوونەتە هۆکاری رووناك کردنەوەی کۆمەڵگەو رێ نیشان دانیان بەرەو رێی راستی، یەکێك لەو کەسانەش ئیمامی نەوەوی بوو کە توانی ببێتە رووناکیەکی گەورە بۆ کۆمەڵگە.

نەوەوی لە بنەرەتدا ناوی یەحیا بوو، باوکیشی ناوی شەرەف بوو، بەڵام بەهۆی گوندەکەیەوە هەر بە نەوەوی ناسرابوو، لە ساڵی ٦٣١ کۆچیدا لەدایك بوو.

ئەم زانا گەورەی ئیسلام لە ناوچەی حۆران لە سووریا لەدایك بوو، ئەویش لە گوندێك کە ناسرابوو بە (نوا)، دایك و باوکێکی باوەڕداری هەبوو کە زۆر خواناس بوون، هەمیشە هەوڵیاندەدا کوڕەکەیان لەسەر ئیمان و خواناسی پەروەردە بکەن.

تەمەنی نەوەوی گەیشتە دە سالان کە ئیتر بە تەواوەتی خووی دایە زانست و کەوتە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و خوێندنی زانستە ئیسلامیەکان، ئیتر کاتێ منداڵان یارییان دەکرد ئەو نەدەچوو بۆ یاری کردن بەڵکو قورئانی پیرۆزی دەخوێند و ئەوەی لەبەری کردبوو دووبارە دەیوتەوە، بۆیە مامۆستایەکی شارەزای ناوچەکە کە بینی ئەم منداڵە وا دەکات خێرا چوو بۆ لای باوکی نەوەوی و داوای لێکرد منداڵەکەی سەرقاڵ نەکات بە هیچ شتێکەوەو هەموو کاتی منداڵەکەی بۆ وەرگرتنی زانست بێت، باوکیشی قسەکەی ئەو مامۆستایەی وەرگرت و هەوڵیدا منداڵەکەی وا لێ بکات هەموو کاتی خۆی

بدات بە وەرگرتنی زانست، ئەوەویش خۆی زۆر حەزی لە زانست بوو، بۆیە بە خۆشحاڵیەوە ئەو پێشنیازەی وەرگرت.

ئەوەبوو لە نزیکەی تەمەنی نۆزدە ساڵیدا بوو کە نەوەوی لە گەڵ باوکیدا پێکەوە هاتن بۆ دیمەشق تا لەوێ خۆی سەرقاڵ بکات بە زانستەوە، ئیتر لەوێ لەپاڵ مزگەوتی ئومەوی نیشتەجێ بوو و خۆی سەرقاڵ کرد بە خوێندنو لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و زانستەکانی تر و تەواوی توانای خۆی خستەگەڕ بۆ ئەو بوارە.

لەو شوێنەدا زۆر بە هەژاری دەژیاو لە بری ئەوەی کەمێك بیری لای خۆشی ژیانیش بێت هەموو کاتی هەر بە خوێندنەوە سەرقاڵ دەکرد.

پاش دوو ساڵ لە سەرقاڵی بە زانستەوە باوکی بڕیاری دا بچێت بۆ حەجی ماڵی خوا، بڕیاری دا نەوەوی کوڕیشی ببات لەگەڵ خۆیدا، ئەوەبوو کوڕ و باوك پێکەوە چوون بۆ حەجی ماڵی خوا، لە سەرەتای چوونەکەیانەوە تووشی تایەکی سەخت بوو و تا رۆژی عەرەفە ئەو تایەی مابوو، بەڵام دواتر بە سەلامەتی گەڕانەوە بۆ سووریا.

دووبارە نەوەوی لە دیمەشقدا کەوتەوە زانست خوازی، ئیتر زۆربەی کتێبەکانی بە لەبەرکردن لەبەر دەکرد نەك هەر ئەوەی تەنها بە خوێندنەوەیان واز بهێنێت، ئیتر هێندە زیرەك و شارەزا بوو تا مامۆستاکەی ئەرکی ئەوەی پێ سپارد وانە بڵێتەوە بە خوێندکارانی خوێندنگەکەی، ئەویش بە جوانی وانەی پێ دەوتنەوە.

ئیتر بەرەبەرە لەگەڵ وەرگرتنی زانستدا نەوەوی وانەشی دەوتەوە، وای لێهات زۆربەی هەرە زۆری کاتی خۆی تایبەت کردبوو بەو بوارەوە، زۆربەی رۆژەکان نزیکەی دوانزە وانەی هەبوو، ئەوەش ماندووبونێکی زۆری دەویست، چونکە وانەکانیشی لە بواری جیاجیادا بوون.

ئینجا کە گەیشتە ساڵی ٦٦٠ کۆچی ئیتر نەوەوی زانا و مامۆستا بڕیاریدا دەست بکات بە نووسینیش، چونکە دەیویست ئەو زانستەی پێیەتی بیگەیەنێت بەوانەش کە

ئەو نایانبینێت، چ ئەوانەی لە ناوچەکانی تر بوون، یان ئەوانەی کە دوای مردنی دێنە دنیا و دەژین، وەك چۆن دەبینین ئەمڕۆ ئێمە کتێبەکانی دەخوێنینەوە.

ئەو کات نەوەوی زاناو مامۆستا تەمەنی نزیکەی ٣٠ ساڵان بوو، واتەهێشتا لەوپەڕی گەنجیدا بوو کەچی کەسانی زۆر لە خۆی بە تەمەنتر زانستیان لێ وەردەگرت و وەك خوێندکار لەبەردەمیدا دادەنیشتن تا شت فێر بن.

ئەم ئیمامە لە بری ئەوەی چاو ببڕێتە خۆشیەکانی دنیا و خوو بداتە ئارەزووەکانی، کەچی هەموو ئەوانەی واز لێ هێنابوو و کاتی خۆی سەرقاڵ دەکرد بە زانستەوە، خۆ ئەو دەیزانی کە گوناه نیە چێژ لە خۆشیەکانی تری دنیا وەربگریت کە خوای گەورە حەڵاڵی کردون، بەڵام نەوەوی هەموو خۆشیەکی لە خواپەرستی و زانست وەرگرتن و زانست بەخشیندا دەبینیەوە، بۆیە ئەوکات دڵخۆش بوو کە سەرقاڵ بوایە بە زانست و پەرستشی خوای گەورەوە.

نەوەوی هەرچەندە خۆی حەزی بە ماڵ و سامانی دنیا نەبوو، بەڵام هەوڵیدەدا مافی خەڵك نەفەوتێ و مافە خوراوەکان بگێڕێتەوە، ئەوەبوو کاتێ سوڵتانی موسڵمانان ویستی هەندێ پارەی زیادە لەسەر بوونی زەوی و زار لە خەڵك وەربگرێت خێرا خەڵکی چوون بۆ لای ئیمامی نەوەوی تا کێشەکەیان بۆ چارەسەر بکات، ئەویش نامەیەکی نووسی بۆ سوڵتان و بە توندی رێگری کرد لەوەی شتی وا بکات و تێیگەیاند کە ئەوە حەرامە و نابێت بیکات، بەڵام سوڵتان تووڕە بوو و داوای کرد موچەکەی نەوەوی ببڕن، کەچی خەڵکەکەی دەوری وتیان ئەی سوڵتان ئەو هیچ مووچەی نیە و لەڕێی خوادا ئەو هەموو خزمەتە دەکات، دواتر ئیمامی نەوەوی کە زانی سوڵتان گوێی لێ نەگرتووە خۆی چوو بۆ لای سوڵتان و قسەی لەگەڵ کرد، ئەوەبوو دواجار سوڵتان ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندەوەو بە هۆی هەوڵەکانی نەوەویەوە خوای گەورە باری سەرشانی خەڵکەکەی ئاسان کرد.

ئیمامی نەوەوی لە کتێبخانەی گشتی ئەوقافی حکوومەت کتێبی هێنابوو و دەیخوێندنەوەو سوودی وەردەگرت لەو کتێبانە، چونکە هەر کەس هەرچەندە زانا و شارەزا بێت هەر دەبێت بەردەوام زانیاری بخوێنێتەوەو واز نەهێنێت لە وەرگرتنی زانست.

دوای ماوەیەك نەوەوی بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی و لەوێ ئەو بەشەی ژیانی بەسەر بەرێت کە ماویەتی، بۆیە چوو چی کتێبی کتبخانەی ئەوقاف لا هەبوو هەموویانی بردەوە، دواتریش چوو بۆ سەر گۆڕی مامۆستاکانی تا مردن و ژیانی ناو گۆڕی بیر بکەوێتەوە، هەروەها نزای خێری کرد بۆیان، پاشان چوو بۆ سەردانی هاوڕێکانی و ماڵئاوایی کرد لێیان، ئینجا دوای ئەوە چوو بۆ سەردانی قودس.

دوای هەموو ئەمانە ئینجا نەوەوی گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی و لەوێ لای دایك و باوکی مایەوە، پاش ماوەیەك لەوێ نەخۆش کەوت، ئەوەبوو بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە لە مانگی رەجەبی ساڵی ٦٧٦ کۆچیدا کۆچی دوایی کردو هەر لە گوندەکەی خۆیشی خرایە ناو گۆڕ.

کاتێ هەواڵی مردنی گەیشت بە موسڵمانان هەموان دڵتەنگ بوون بۆی و دەگریان کە چۆن زانایەکی وا گەورەیان لەدەست چوو، ئیتر سەرکردەو کەسە دیارەکان چوو تا نوێژ بکەن لەسەری.

بەراستی وایە ناخۆشترین رووداوی ناو کۆمەڵگە لەدەستدان و مردنی زانایانی خواناسە، چونکە زانایان دەبنە چرای رووناکی بۆ کۆمەڵگەو رێی راستییان نیشان دەدەن، ئەوان فێرمان دەکەن چۆن بەرەو لای خوای گەورە بچین و خۆمان بپارێزین لە داوی شەیتان و دارودەستەکەی، بۆیە بە مردنی ئەو کەسانە زیانی گەورەمان بەردەکەوێت.

# پەندو وانە

هەموو ئەو زانایەی لە مێژووی ئیسلامیدا باس کراون دەبینین بەشی زۆریان هەر لە منداڵیەوە حەزیان کردووە بە وەرگرتنی زانست و خوویان داوەتە ئەو بوارەو چوونەتە خزمەت مامۆستا شارەزاکان تا ئەوەی بەردەوام بون تا بون بەو زانایانە، بۆیە زۆر پێویستە ئێمەش هەر لە منداڵیەوە بنەوینە زانست وەرگرتن و هیوامان وابێت کە ئێمەش ببینە زانایەك و خزمەتی گەورە پێشکەش بکەین بە گەل و برایانمان.

پێویستە زانایان لە پێش هەمواندا و پاشان هەموو کەسێکی دڵسۆزیش بیریان لای کێشەو نارەحەتی خەڵك بێت و کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکەن، لەوەشدا نەترسن و ئەگەر دەسەڵات هەڵە یان ستەمێکی هەبوو دەبێت بۆی راست بکەنەوەو ئاگاداری بکەنەوە لەو هەڵە یان ستەمەی کە دەیکات.

کەسی باوەڕدار هەمیشە دەبێت بە جوانی ئەمانەتی لای خۆی بپارێزێت و بە سەلامەتی وبێ کەموکورتی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە نەگەڕاندنەوەی ئەمانەت سیفەتی کەسی دووڕوو و ناپاکە، سەیر بکەن چۆن ئیمامی نەوەوی ئەو کتێبانەی گێڕایەوە کەلە لای بوون ئینجا ئەو شارەی جێهێشت.

دەبێت کاتێك سەردانی گۆڕستان دەکەین مردن و ژیانی دوای مردنمان بیر بکەوێتەوە تا خۆمان لە هەڵە و تاوان بپارێزین وبزانین رۆژێك دێت خەڵکی تریش دێن بۆ سەر گۆڕی ئێمە، هەروەها دەبێت نزای خێر بکەین بۆ مردووەکان و سەلامیان لێ بکەین چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وای کردووە.

مردن لە ڕێی هەمووماندایە و هەموو کەس هەرچەندە گەورە زانا یان دەوڵەمەند بێت هەر دەمرێت، بۆیە چاکترین شت ئەوەیە مرۆڤ کاری چاکەی زۆر کۆبکاتەوە تا کاتێ مرد و گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە چاکەی زۆری پێ بێت، چونکە مردن کاتی نەزانراوەو لەوانەیە زۆر زوو بێتە رێمان، بۆیە کەسی ژیر ئەوەیە زوو چاکەی زۆر کۆبکاتەوەو قیامەتی خۆی رۆشن بکاتەوە.

## پرسیارەکان

١. ئیمامی نەوەوی لە کوێ دەژیا؟ ئەو وڵاتەی ئەو بە چی ناسراوە؟

٢. بۆچی ئیمامی نەوەوی گوندەکەی خۆی جێهێشت و چوو بۆ سووریا؟

٣. باسی ئەو کێشەی خەڵك بکە کە ئیمامی نەوەوی چارەسەری کرد.

٤. ئیمامی نەوەوی پێش مردنی چەند کارێکی کرد، ئەو کارانە چی بوون؟

٥. ئایا تۆ ئیمامی نەوەویت خۆش دەوێت؟ لەبەر چی؟

٦. ئایا تۆیش هەوڵت داوە زانست وەربگریت و لە داهاتوودا ببیت بە زانایەکی گەورە؟

# یووسفی کوڕی تاشفین

کاتێ ئیسلام هات و بڵاوبوویەوە، موسڵمانان توانییان ئیسلام بگەیەنن بە ناوچە جیاجیاکانی جیهان، لەوانە بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو باکوور و باشووردا ئیسلام بڵاوبوویەوە، یەکێك لەو ناوچانەش کە ئیسلامی پێ گەیشت بریتی بوو لە باکووری کیشوەری ئەفریقا کە ئەمڕۆ دابەش بووە بۆ چەند وڵاتێکی ئیسلام.

کاتێ ئیسلام گەیشتە ئەو ناوچانە خەڵکی بە جوانی ئیسلامیان وەرگرتو ئەوانیش توانییان خزمەتی گەورە پێشکەش بکەن چونکە چەندین زانا وسەرکردەی گەورە لەو ناوچانەدا دەرکەوتن، بەمە دەبینین لە هەموو ناوچەیەکی جیهاندا هەر نەتەوەیەك بە جۆرێ خزمەتی خۆی پێشکەش کردووە، لەو ناوچەشدا یەکێك لەو سەرکردە گەورانەی موسڵمانان کە دەرکەوت بریتی بوو لە یووسف.

یووسف کوڕی تاشفین بوو، سەر بە هۆزی گەورەی صەنهاجە بوو، لە ساڵی ٤٠٠ کۆچی لەدایك بوو، هۆزەکەشی دەسەڵاتداری ناوچەکە بوون، چەندین زانا و سەرکردەی گەورە لەناو ئەو هۆزەدا دەرکەوتن وەك ئیمام عەبدوڵای کوڕی یاسین، بەم جۆرە یووسف لەناو هۆزێکی بەهێزو باوەڕدار و ناسراودا دەرکەوت و بە ناز و ڕێزەوە گەورە بوو.

هەر لە سەرەتای ژیانەوە یووسف لە ناو بیاباندا زانستی وەرگرتو لە زانایانی گەورەی فەرموودەناسەوە گوێی گرت لە فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لەسەر بنەمای زانست و ڕێنماییەکانی زانای گەورەی هۆزەکەیان ئیمام عەبدوڵای کوڕی یاسین زانست و ڕێنماییەکانی ئیسلامی وەردەگرت، دەچویە خزمەت مامۆستایان و هەوڵی دەدا زۆرترین کاتی خۆی تایبەت بکات بە زانست وەرگرتن.

یووسف تەنها لە بواری زانستدا خۆی پێ نەگەیاند، بەڵکو لە مەیدانی سەربازیشەوە خۆی پێ گەیاند و هونەرەکانی جەنگ و جیهاد فێر بوو چونکە زۆر حەزی لە جیهادی رێی خوا بوو، هەروەها زانیاری پێویستی لەسەر سیاسەت وەرگرت لە روانگەی شەریعەتی ئیسلامەوە تا بتوانێت خزمەتی خۆی پێشکەش بکات.

یووسف بەشداری جیهاد و غەزای دەکرد و هاودەم بەو زانستەی پێی بوو حەزی دەکرد خێر و گەورەیی جیهادی رێی خوایشی دەست بکەوێت، ئەوەبوو لە جەنگێکدا کە ناسرابوو بە جەنگی واحات و لە ساڵی ٤٤٨ کۆچیدا روویدا تیایدا یووسف سەرکردایەتی سوپای موجاهیدانی کرد، لەو جەنگەدا یووسف توانی شاری سەجلماسە بگرێت، بۆیە سەرکردەی موسڵمانان لەو ناوچەیە بریاری دا یووسف بکات بە بەرپرسی ئەو شارە، ئەویش زۆر بە جوانی ئەو شارەی بەرێوە دەبردو نموونەیەکی زۆر جوانی پێشکەش کرد.

دوای ماوەیەکی تر یووسف دەستی کردەوە بە غەزاو رووی کردە چەند شوێن و شارێکی تر و دواجار خوای گەورە سەرکەوتنی پێ بەخشی، پاشان روویکردە شارێکی تری زۆر گرنگ و ناسراو بە ناوی ئەغمات کە بنکەیەکی کۆن و گرنگی مەسیحیەت بوو و بووبوو بە بنکەیەك بۆ ئەو بەربەریانەی کە جوولەکە بوون، ئەوەبوو هێرشی بردە سەریان تا لە ساڵی ٤٤٩ کۆچیدا سوپای موسڵمانان توانی شارەکە ئازاد بکات.

پرسیار: ئەو دەوڵەتەی یووسف تیایدا بوو بە چی ناسرابوو؟

وەڵام: ئەو دەوڵەتە ناسرابوو بە دەوڵەتی مورابیتەکان واتە سەنگەرنشینان، واتە دەوڵەتی ئەوانەی لەرێی خوادا سەنگەر دەگرن.

مورابیتەکان ئەم جار بڕیاریان دا دەوڵەتی بێباوەڕی برغواتە لەناو ببەن، لەناو سوپاکەشدا یووسفی کوڕی تاشفین بەشدار بوو، لەو جەنگەدا ئیمام عەبدوڵای کوڕی یوسف شەهید بوو، ئەمە بوو بە بنەرەتێك تا یووسف شوێنی بگرێتەوە بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەتی مورابیتەکان.

ئەوەبوو ئەبووبەکری سەرکردەی وڵات چوو بۆ دەرەوەی وڵات و یووسفی لە شوێنی خۆی دانا، خەڵکیش زۆر رازی بوون لە دەسەڵاتی یووسف بۆیە کاتێ ئەبووبەکری مامی گەڕایەوە بە بەرچاوی خەڵکەوە بڕیاری دا واز بهێنێت لە دەسەڵات بۆ یووسفی برازای، ئامۆژگاری یووسفی کرد و وتی وا من ئەم کارەم دایە دەست تۆ و منیش لەوە بەرپرسم، دەی لەخوا بترسە بەرامبەر بە موسڵمانان و لەگەڵیان چاك بە، من و خۆیشت لە دۆزەخ رزگار بکە.

یووسفیش بە جوانی کاروباری بەڕێوە دەبرد و ئاژاوە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی وڵاتی نەهێشت ژ یەکریزی و بەهێزی بەخشی بە دەوڵەتەکەی، بەردەوامیش درێژەی دەدا بە جیهادی رێی خوا، هەندێ ناوچەشی بە ئاشتی ئازاد کرد وەك لە ساڵی ٤٥٥ دا بە ئاشتی چوویە ناو شاری فاس.

دواتر یووسف هەوڵی دا هەموو مەغریبی ئیسلامی یەك بخات و ناکۆکی نێوان موسڵمانان نەهێڵێت، پاش هەوڵێکی زۆر و تووش بوون بە چەند جەنگێکی سەخت دواجار توانی ئەو کارە بکات و وڵات بکات بە یەکپارچەو یەکڕیز، ئەمەش نزیکەی ٣٠ ساڵ هەوڵ و ماندووبوونی ویست.

لە نزیك دەەوڵەتەکەی یووسف لە ئەندەلوس چەند دەوڵەتێکی بچووك و پارچە پارچەی ئیسلامی هەبوون کە بەهۆی ناکۆکی نێوان خۆیان لەلایەن خاچپەرستە

مەسیحیەکانەوە هێرشیان دەکرایە سەر تا خاکی موسڵمانان داگیر بکەن، پاش ئەوەی ئەوانە داوای یارمەتییان کرد لە یووسف ئەویش بە دەریادا پەڕیەوەو چوو بۆ یارمەتیدانی برا موسڵمانەکانی.

سەرەتا یووسف نامەی نارد بۆ سەرکردەی مەسیحیەکان و داوای لێکرد موسڵمان بێت و واز بهێنێت لە هێرش بردنە سەر موسڵمانان، بەلام ئەو رازی نەبوو، بۆیە یووسف بڕیاری دا هێرش بباتە سەر ئەو ستەمکارەو موسڵمانان لە دەستی رزگار بکات، ئەوکات تەمەنی یووسف زۆر بوو و پیریش بووبوو، بەڵام بەڵێنی دابوو تا دوا هەناسە وازنەهێنێت لە جیهادی رێی خوا.

سەرکردەی مەسیحیەکان ویستی فێڵ بکات لە موسڵمانان و نامەی نارد رۆژی هەینی هێرش ناکەین چونکە لای موسڵمانان پیرۆزەو ئێمەش رێزیان دەگرین، ئەمەی کرد تا موسڵمانان ئاگایان لە خۆیان نەبێت و هێرش بکەنە سەریان، بەڵام یووسف زۆر ژیر بوو و هەرچەندە بەڵێنی دا هێرش نەبات تا موسڵمان نەبێتە بەڵێن شکێن بەڵام سوپای تەواو ئامادە کرد بۆ بەرگری چونکە دەیزانی مەسیحیەکان ناپاکی دەنوێنن و بەڵێنەکە دەشکێنن.

ئەوەبوو مەسیحیەکان هێرشیان هێناو پاش بەرەورووبوونەوە لە شوێنێك کە پێی دەوترا زەلاقە هەردوو سوپای موسڵمانان و مەسیحیەکان بەرنگار بوونەوەو جەنگێکی سەخت روویدا کە ناسراوە بە جەنگی زەلاقە، ئەو رۆژەش رۆژی هەینی بوو، دواجار پاش جەنگێکی سەخت موسڵمانان سەرکەوتن و سەرکردەی مەسیحیەکانیش بریندار بوو.

یووسفی سەرکردەی زاناو موجاهیدی وڵاتی موسڵمانان پاش تەمەنێکی زۆر کە نزیکەی سەد ساڵ تەمەنی هەبوو لە مانگی موحەرەمی ساڵی ٥٠٠ ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.

## پەندو وانە

لە ناو ئیسلامدا هەموو نەتەوەکان جێیان ئەبێتەوەو قبووڵ کراون، ئیتر لەخواترسان بەپێی رەنگ و نەتەوە نیە، بەڵکو ئەوەی بنەڕەتە لە ئیسلامدا لەخوا ترسان و پەیرەوی جوانتری پەیامی ئیسلامە، بۆیە هیچ کات ئیسلام جیاوازی ناکات لەنێوان کورد و عەرەب و تورك و فارس و ئینگلیز و هەر نەتەوەیەکی تردا، بەڵکو جیاوازیەکە لەسەر ئەوەیە کامیان کاری چاکە زیاتر بکات، هەر بۆیە هەرچەندە یووسف خەڵکی باکووری ئەفریقا بوو توانی خزمەتێکی زۆر گەورە پێشکەش بکات بە موسڵمانان‌و تا ئێستاش هەموو موسڵمانانی جیهان شانازی پێوە بکەن.

دەبێت موسڵمان تەنها یەك لایەنی ژیان نەگرێت، بەڵکو هەوڵ بدات هەموو لایەنەکانی ژیان وەربگرێت تا بتوانێت لە هەموو بوارەکاندا سەرکەوتوو بێت، دەبینین یووسف هەم لە لایەنی زانستی و هەم لایەنی سەربازی و هەم لایەنی سیاسیشەوە خۆی پێگەیاند و دواتریش بە هەموو ئەو لایەن‌و بوارانەی توانی خزمەتی گەورە پێشکەش بکات بە موسڵمانان.

جیهادی رێی خوا گەورەترین پاداشتی هەیە لای خوای گەورەو هەموو موسڵمانێك لە پێناو پاراستنی خاکی موسڵمانان و سەرخستنی ئایینی خوادا دەبێت حەز بە جیهاد بکات، بەڵام جیهاد هەر لە خۆوە ناکرێت و دەبێت سەرکردەی موسڵمانان بریاری جیهاد بدات ئەوکات موسڵمانانیش جیهاد دەکەن.

## پرسیارەکان

١. یووسف لە چ ناوچەیەك دەژیا؟ ناوی باوکی چی بوو؟

٢. دیارترین مامۆستای یووسف کێ بوو کە یوسف زۆر پێی سەرسام بوو؟

٣. یووسف چۆن دەسەڵاتی دەوڵەتی گرتەدەست لە بری مامی؟

٤. باسی حەزی یووسف بکە بۆ جیهادی ڕێی خوا.

٥. یووسف کە دەسەڵاتی گرتە دەست هەوڵی چی دا؟ ئایا سەرکەوتوو بوو لەوەدا؟

٦. یووسف بۆچی چوو بۆ ئەندەلوس؟

٧. جەنگی زەلاقە چی بوو؟ بە کورتی باسی بکە.

٨. کاتێ یووسف مرد تەمەنی چەند ساڵ بوو؟ ئەی ساڵی مردنەکەی کەی بوو؟

## ئیبن تەیمیە

لە ناوچەیەکی کوردستانی ئازیز شارێك هەبوو پێی دەوترا حەران، ئەم شارە کاتی زوو نشینگەی پێغەمبەری خوا ئیبراهیم پێغەمبەر بووە، بەڵام دواتر کەسانی بێباوەڕ تیایدا دەرکەوتن کە پێیان دەوترا صابیئیەکان، ئەمانە لەبری خوای گەورە ئەستێرەیان دەپەرست.

کاتێ ئاینی ئیسلام هات لە سەردەمی خەلیفەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتتابدا لە لایەن موسڵمانانەوە شاری حەران ئازاد کرا، ئیتر ئاینی خوا گەیشتە ئەو شارەو ریشەی بتپەرستی تیایدا وشك بوو.

لە ناو ئەم شارە کوردیەدا بنەماڵەیەکی گەورەو خواناس دەرکەوت کە زۆربەی هەرە زۆری کەسەکانی زانای گەورە و هەڵکەوتەی ناو موسڵمانان بوون.

پرسیار ئەو بنەماڵەیە کێ بوون؟

وەڵام: ئەو بنەماڵەیە بریتی بوون لە بنەماڵەی تەیمیە، ئەوانە دەیان زانای گەورەیان پێشکەش کرد بە موسڵمانانو تا ئەمڕۆش موسڵمانان قەرزاری زانست و خزمەتی ئەوانن.

لەو شارەدا و لەناو ئەو بنەماڵەدا زانایەکی گەورە هەبوو کە ناوی عەبدولحەلیم بوو، ئەو زانایە هەر لە منداڵیەوە لەسەر دەستی باوکی زانستی وەرگرت و پێگەیشت و دواتر کەوتە وانەوتنەوەو بڵاوکردنەوەی زانستو خزمەت کردن بە موسڵمانان، تا کاتی خۆی هات ژنێکی هێنا بە ناوی ستونیعەم کە ئافرەتێکی زیرەك و زانا بووە.

خوای گەورە چەند منداڵێکی بەخشی بەم ژن وپیاوە زاناو خواناسە، هەموو منداڵەکانیشیان کەسی دیار و زانا دەرچوون کە توانییان خزمەتێکی گەورە پێشکەش بکەن.

پرسیار: ناوی منداڵەکانی چی بوون؟ وەڵام: ناوی منداڵەکانی بریتی بوون لە (عەبدورحمان، عەبدوڵا، ئەحمەد).

لە هەموویان زیرەکتر و زاناتریان ئەحمەد بوو کە لەبەر زۆر زیرەکیەکەی بوو بە کەسایەتی هەرە دیاری بنەماڵەکەی، هەر لەبەر ئەوەش بە ناوی بنەماڵەکەیەوە ناسراوەو بە ئیبن تەیمیە ناوی دەبرێت.

ئیبن تەیمیە لە ساڵی ٦٦١ کۆچی لە شاری حەران لەدایك بوو و لەوێ سەرەتای ژیانی دەستی پێکرد، هەر لە منداڵیەوە دایك و باوکی گرنگیەکی زۆریان پێدا تا زانستی زۆری پێ ببەخشن، بەڵام هێندەی نەبرد باری ژیانیان تێکچوو و ناچار بوون شارو ناوچەی خۆیان جێ بهێڵن، ئەوکات هێشتا تەمەنی ئیبن تەیمیە شەش ساڵ زیاتر نەبوو.

پرسیار:بۆچی ناچار بوون شارو ناوچەی خۆیان جێ بهێڵن؟

وەڵام: چونکە مەغۆلەکان کە خەڵکێکی درندەو پیاوکوژ و خراپەکار بوون هێرشیان هێنا بۆ سەر شارەکەیان، بۆیە ئەو خێزانە ناچار بوون کۆچ بکەن بۆ وڵاتی شام بۆ شاری دیمەشق، بۆ ئەوەی دەستگیر نەکرێن بە شەو کۆچیان کرد و هەرچی کتێبیان هەبوو بە چەند عەرەبانەیەك لەگەڵ خۆیاندا بردیان تا لەوێش لە زانست نەبڕێن.

کاتێ چوون بۆ شاری دیمەشق لەوێ باوکی لە مزگەوتدا وانەی دەوتەوەو ئیبن تەیمیەش بەردەوام زانستی وەردەگرت و لە خزمەت چەندین زانا و مامۆستادا زانستی وەردەگرت، بەوجۆرە گەورە بوو تا گەیشتە تەمەنی گەنجی.

رۆژێك عەبدولحەلیم منداڵەکانی کۆکردەوە تا بیانبات بۆ سەیران و گەڕان، بەڵام ئیبن تەیمیە داوای کرد لە باوکی رێی بدات نەچێت بۆ سەیرانەکە، باوکیشی رازی بوو، تا باوکی و براکانی چوون بۆ گەڕانەکەیان و هاتنەوە ئیبن تەیمیە کتێبێکی گرنگ و گەورەی زانایەکی لەبەرکردبوو، کە باوکی هاتەوەو ئەوەی بینی تەواو سەرسام بوو بە

تواناى کوڕەکەى، بۆیە ترسا خەڵکى زیانى پێ بگەیەنن، بە ئیبن تەیمیەى کوڕى وت ڕۆڵە شیرینەکەم ئەمە بۆ کەس باس نەکەیت.

جارێك زانایەکى حەلەبى هاتە دیمەشق و بیستبووى ئیبن تەیمیە زیرەکە، بۆیە چوو بۆ لاى تا تاقى بکاتەوە، کاتێ پرسیارى لێکرد و ئیبن تەیمیە وەڵامى دایەوە هێندە زیرەکانەو بەهێز وەڵامى دایەوە کە زاناکە تەواو پێى سەرسام بوو، زاناکە یەکسەر وتى ئەگەر ئەم کوڕە بمێنێت لە داهاتوودا ڕۆڵى زۆر گەورەى دەبێت.

ئیتر هێندە زیرەك بوو تا خێرا بوو بە زانایەکى دیار و لە تەمەنى حەڤدە ساڵیدا فەتواى دەدا لەسەر مەسەلەکان، فەتواکانیشى ڕاست بوون و زانایان ڕەخنەیان لێ نەدەگرت.

ئیبن تەیمیە هیچ کات پارەو شتى لە خەڵك وەرنەدەگرت چونکە هەر لە منداڵیەوە بەڵێنى دابوو بە خواى گەورە کە لەسەر قورئان پاداشت وەرنەگرێت، بۆیە کاتێك قورئانى لەبەر دەکرد و کەسێك بیویستایە خەڵاتى بکات وەرى نەدەگرت، چونکە دەیوت من تەنها لاى خوا پاداشت وەردەگرم.

هیچ کات ئیبن تەیمیە ڕەخنەى نەدەگرت لە خواردن، بەڵکو بە هەر خواردنێکى حەڵاڵ ڕازى بوو و نارەزاییشى دەرنەدەبڕى.

لە ساڵى ٦٩٢ کۆچیدا واتە تەمەنى ٣١ ساڵى ئیبن تەیمیە لەگەڵ کاروانێکدا چوو بۆ حەج، لە ڕێگەى سەفەریاندا ڕەشەبایەکى توند هەڵیکرد کە ژمارەیەکى زۆرى خەڵکەکە بەو هۆیەوە مردن، بەڵام ئیبن تەیمیەو ژمارەیەکى تر لە خەڵکەکە ڕزگاریان بوو.

دواى ئەوەى باوکى کۆچى دوایى کرد ئیبن تەیمیە لە شوێنى باوکیدا لە مزگەوتدا وانەى دەوتەوە، هێندە زیرەك بوو کە وەرەقەو نووسین لەبەر دەستیدا نەبوو و هەموو شتەکانى لەبەر بوو، ئیبن تەیمیە لە وتارەکانیدا زۆر گرنگى دەدا بە فەرموودە و لە

ڕێبازی ڕاستی زانایانی پێشوو لای نەدەدا، دوای وتارەكەش گوێی دەگرت لە پرسیاری خەڵك و وەڵامی پرسیارەكانی دەدایەوە.

جارێك ئیبن تەیمیە نەخۆش كەوت، كاتێ چوو بۆ لای پزیشك پزیشكەكە پێی وت زۆر مەخوێنەرەوەو خۆت ماندوو مەكە، لە وەڵامدا ئیبن تەیمیە وتی مەگەر ئێوە ناڵێن ئەگەر كەسێك حەزەكەی بێتەدیو خۆشی بێت ئەوە بۆ تەندروستی باشە، دەی من لەكاتی خوێندنەوەو زانستدا تەواو خۆشیمە و دەبێت باش بێت بۆم، بۆیە هۆكاری نەخۆشیەكەی من ئەوە نیە.

ئیبن تەیمیە لە بەرگریكردنی لە موسڵمانان زۆر دلێر و نەترس بوو، كاتێ مەغۆلەكان هاتن و شامیان داگیر دەكرد سەكردەكەیان ناوی غازان خان بوو، ئیبن تەیمیە لەگەڵ ژمارەیەك زانای تر چوون بۆ لای، ئیبن تەیمیە هێندە بە ڕەقی قسەی لەگەڵ كرد كە هەموو زاناكانی تر ترسان، ئەو داوای كرد هەموو بەندكراوانی موسڵمانان و بەندكراوە ناموسڵمانەكانیش ئازاد بكرێن، ئەویش ڕازی بوو و هەموویانی ئازاد كرد، كاتێ گەڕانەوە زاناكانی تر وتیان لەگەڵ ئەو ناچینەوە تووشی شتێكمان دەكات، كەچی ویستی خوا وابوو ئیبن تیمیە بە سەلامەت گەیشتەوە، كەچی ئەوان تووشی دەستەیەكی مەغۆلە ڕێگرەكان بوون كە چییان پێ بوو لێیان سەندن و ئازاری زۆریشیان دان.

كاتێ جارێكی تر مەغۆلەكان هاتن تا خاكی شام داگیر بكەن ئیبن تەیمیە هانی موسڵمانانی دا تا ڕێیان پێ نەدەن و وتاری بۆ دەدان، خۆیشی چوو بۆ لای سەركردەی موسڵمانان لە میصر تا ڕازی بكات بێت بۆ هاوكارییان، ئەوەبوو بە سوپایەكەوە هاودەم بە سوڵتان گەڕایەوەو لە جەنگەكەدا خۆیشی بەشداری كرد و خوای گەورەش سەركەوتنی بەخشی بە موسڵمانان، لە جەنگەكەشدا ئیبن تەیمیە بەردەوام موسڵمانانی هاندەدا تا نەترسن و لەڕێی خوادا بە گەرمی بجەنگن چونكە خوا موسڵمانان سەردەخات.

هەمیشە هەندێ كەس هەن كە حەز ناكەن كەس لەوان گەورەتر بێت و خۆیان بە گەورە دەزانن، بۆیە ژمارەیەك لەو جۆرە كەسانە كەوتنە پیلان گێڕان دژ بە ئیبن تەیمیەو لای دەسەڵاتداران تۆمەتیان بۆ دروست دەكرد تا ئەوەی بوونە هۆكاری بەندكردنی ئیبن تەیمیە، سێ جار لە دادگای دیمەشق دادگایی كرا، بەڵام لە هیچ كامیاندا نەیانتوانی بیسەلمێنن كە تاوانبارە و كاتێ زانییان بێ تاوانە ئیبن تەیمیەیان ئازاد كرد.

بەڵام ئەمجار كەسانێكی ناو میصر كە رقیان بوو لە ناوبانگی ئیبن تەیمیە تۆمەتیان بۆ دروست كرد و داوایان كرد لە میصر دادگایی بكرێت، خەلیفەش ئەوكات لە میصر بوو، ئەوان سەركردەی ولاتیان رازی كرد تا داوا لە دەسەڵاتداری شام بكات ئیبن تەیمیە بنێرێت بۆ میصر، هەرچەند ئەو رازی نەبوو بەڵام ئیبن تەیمیە خۆی بڕیاری دا بچێت و لەوێیش وەڵامی گومانەكان بداتەوە.

ئیبن تەیمیە بەڕێكەوت بەرەو میصر و لە كۆتاییەكانی مانگی رەمەزاندا گەیشتە شاری قاهیرە، كاتێ گەیشت رۆژی هەینی بوو، لە دوای نوێژی هەینی لەگەڵ زاناو كەسە دیارەكان مشتومڕی ئەنجامدا، بەڵام دواجار لەوێیش بەندكراو دواتر گوازرایەوە بۆ بەندیخانەیەك كە پێی دەوترا (جب)، بەڵكو دوو برایشی لەگەڵ خۆیدا بەند كران.

هێندە دژایەتی ئەو زانایە كرا كە تەنانەت ئەوانەش شوێن نووسینەكانی بكەوتنایە ئەو كەسانەش بەند دەكران.

پرسیار: بۆچی دەسەڵاتداران وایان دەكرد لە كاتێكدا موسڵمانیش بوون؟

وەڵام: لەبەرئەوەی هەندێ كەس كە حەزیان نەدەكرد ئیبن تەیمیە وەك زانایەكی گەورە دەربكەوێت وایان وتبوو بە دەسەڵاتداران كە ئیبن تەیمیە خەڵكی گومڕا دەكات، بەڵام ئیبن تەیمیە رێی نەدەدا كەس لە دژی دەسەڵاتدارانی موسڵمانان هیچ بكەن

چونکە نەبوونی ئاژاوەو پاراستنی یەکریزی و ئاشتی ناو موسڵمانانی لەلا گرنگتر بوو تا ئازادبوونی خۆی.

ئیبن تەیمیە پاش ماوەیەك ئازاد کراو ئەو ماوەی ئازاد کرا لە مزگەوتەکاندا وانەی دەوتەوەو خەڵکی فێری زانست دەکرد، هاوکات نامەی دەنارد بۆ دایکی خۆشەویستی و بۆ خەڵکی دیمەشق و خۆشەویستی خۆی نیشان دەدا بۆیان.

هێندەی نەبرد جارێکی تر ئیبن تەیمیە بەند کرا، ئەمجارەش یەکێك لە براکانی لەگەڵیدا بەندکرا، بەڵام هێندەی پێ نەچوو کە سوڵتانی موسڵمانان خۆی هات بۆ بەندیخانە بۆ لای ئیبن تەیمیەو ئازادی کرد.

پرسیار: ئەو سوڵتانە کێ بوو کە ئیبن تەیمیەی ئازاد کرد؟

وەڵام: ئەوسوڵتانە ناوی سوڵتان ناصر بوو کە کاتێ توانی بێتە سەر دەسەڵات خێرا ئیبن تەیمیەی ئازاد کرد.

پاش حەوت ساڵ مانەوە لە میصر دواجار ئیبن تەیمیە لەگەڵ سوڵتانی موسڵماناندا گەڕایەوە بۆ شام، لەوێ پێشوازیەکی گەرمی لێکراو خێرا ئەویش دەستی کردەوە بە وانە وتنەوە.

بەڵام هێندەی نەبرد جارێکی تر ئەو زانایە کەوتە بەر پیلانی ناحەزان و سەرلەنوێ تۆمەتیان بۆ دروست کرد و ئیبن تەیمیەی زانای بێ تاوان جارێکی تر بەند کرا، ئیتر لەو بەندیخانەیەدا مایەوە تا ئەوەی دواجار لەوێ نەخۆش کەوت و کۆچی دوایی کرد.

لە ماوەی ئەو بەند بوونەیدا ئیبن تەیمیە هەشتاو یەك جار هەموو قورئانی پیرۆزی خوێندەوەو زیکرو پەرستشی زۆری دەکرد.

کاتێ کۆچی دوایی کرد هەموان بە مردنی دڵتەنگ بوون تەنانەت ئەوانەش کە دژی بوون، شار تەواو قەرەباڵغی دایگرت و هەموان هاتن بۆ نوێژکردن لەسەر تەرمەکەی و

مەراسیمی ئەسپەردەکردنەکەی، هێندە قەرەباڵغ بوو کە بازاڕی شار داخرا، نزیکەی پێنج سەد هەزار کەس نوێژیان کرد لەسەر تەرمی ئیبن تەیمیە.

پاش خۆی ئیبن تەیمیە نووسین و کتێبی زۆری جێهێشت بۆ موسڵمانان، کتێبەکانی نزیکەی سەد کتێب زیاتر دەبوون کە تا ئەمڕۆش موسڵمانان دەیانخوێننەوەو سوود وەردەگرن لە زانستەکەی.

## پەند و وانە

زۆر پێویستە حەز بکەین بە دوای زانستدا بگەڕێین و هەمیشە لەگەڵ کەسانی زیرەك و زانادا هەڵسوکەوت بکەین.

سوپاسی خوای گەورە بکەین کە لە نارەحەتی و ستەم و هێرشی دوژمنان بمانپارێزێت، نابێت موسڵمان ئاوات بە بەرنگاربونەوەی دوژمن بخوازێت و داوا لە خوا بکات سەلامەتی پێ ببەخشێت، چونکە ئاژاوەو جەنگ هۆکاری وێرانیە.

گەورەترین سامانی بەنرخ و نەفەوتاو بریتیە لە زانست و دەبێت لە هەموو کاتێکدا هەوڵی زانستخوازی بدەین، بە راستی کتێب هاوڕێیەکی خۆشەویستو دڵسۆزەو دەبێت بە جوانی کتێبەکانمان بپارێزین.

جیهاد کردن لەڕێی خوای گەورەدا فەزڵی زۆری هەیە و بەردەوام هاوەڵان و زانایانی ئیسلام ئەگەر جیهادکردنیان بەدی کردبێت تیایدا بەشدار بون.

نابێت هەرگیز رەخنە بگرین لە خواردن و بە هەموو بەخششێکی خوا رازی بین، ئەگەر بەدڵمان نەبوو خواردنەکە نەخۆین و بێ گلەیی کردن بگەڕێینەوە دواوە.

هەمیشە پشت بەخوای گەورە ببەستین و دڵنیا بین خوای گەورە ئاگای لە هەموو شتێکەو هەرچیەك خوا بیەوێت تەنها ئەوە دەبێت.

دەبێت هەمیشە وریای ئاشتی و خۆشی موسڵمانان بین و خۆمان بپارێزین لە فیتنەو ئاژاوە نانەوە وەك چۆن ئیبن تەیمیە هەرچەندە بەندیش کرابوو کەچی نەیدەهێشت بەهۆی ئەوەوە موسڵمانان کێشە بکەوێتە نێوانیانەوە.

خوای گەورە پاڵپشتی موسڵمانانەو هەرکات موسڵمان راستیەکی زانی و پێویست بوو بیڵێت نابێت بترسێت و دەبێت بیڵێت بەتایبەت وتنی راستی لەبەردەم کەسی ستەمکاردا گەورەترین جیهادی رێی خوایە.

## پرسیارەکان

١. ئیبن تەیمیە ناوی چی بوو؟ لە کوێ لەدایك بوو؟

٢. بنەماڵەی تەیمیە بە چی ناسراون؟

٣. ئیبن تەیمیە چۆن تەمەنی منداڵی بەسەر برد؟

٤. باسی گەشتی حەجی ئیبن تەیمیە بکە.

٥. کاتێ مەغۆلەکان هاتن بۆچی ئیبن تەیمیە چو بۆ میصر؟

٦. بۆچی ئیبن تەیمیە زوو زوو بەند دەکرا؟

٧. باسی مردنی ئیبن تەیمیە بکە.

٨. دەتوانیت ژیانی ئەم زانایە باس بکەیت بۆ خوشك و براکانت یان بۆ هاورێکانت؟

# ئیبن قەیم

یەکێکی تر لە زانا ناودارو گەورەکانی جیهانی ئیسلامی بریتی بووە لە ئیبن قەییمی جەوزی کە تا ئەمڕۆش نووسینەکانی لەبەر دەستی موسڵماناندان و سوودیان لێ دەبینرێت، بەڵکو یەکێکە لەو زانایانەی کە تا ئەمڕۆش نووسینەکانی زۆر بایەخییان پێ دەدرێت و وەردەگێردرێن بۆ زمانە جۆراوجۆرەکان لەوانەش هەندێ کتێبی وەرگێردراون بۆ سەر زمانی پاراوی کوردی.

ئیبن قەییم لە شاری دیمەشق لەدایك بوو، دیمەشق پایتەختی ئەمڕۆی سووریایە، هەر لە زووەوە ئەو شارە مەڵبەند و لانەی زانایان و کەسە گەورەکان بووە، وەك بینیمان ئیبن تەیمیەش کە زانایەکی گەورەی ئیسلام بوو لە دیمەشق ژیا و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.

پرسیار: ئیبن قەیم ناوی چی بوو؟

وەڵام: ئیبن قەیم ناوی موحەممەد بووەو باوکیشی ناوی قەیم بووە، ئەو بنەماڵەیە ناسرابوون بە جەوزی، هەر بۆیە موحەممەدی زاناش لە بری ئەوەی بەناوی خۆیەوە ناو دەربکات زیاتر ناسراوە بە ئیبن قەیمی جەوزی، قەیمی باوکی یەکێك بووە لە زانا ناسراوەکانی ناو دیمەشق و لە خوێندنگەی جەوزی لە دیمەشق سەرقاڵ بوو، بۆیە هەم خۆیشی و هەم نەوەکانیشی ناسران بە جەوزی لەبەر بوونی باوکیان لەو قوتابخانەیەدا.

ئیبن قەیم لە ساڵی ٦٩١ کۆچی لە شاری دیمەشق لەدایك بوو، هەر لە سەرەتای ژیانیەوە لەناو خاك و ناوچەی زانایاندا گەورە بوو.

ئیبن قەیم کەسێکی زۆر لەخواترس و باوەڕدار بوو، ئەو هەمیشە سەرقاڵ بوو بە پەرستشی خوای گەورە و خۆی دەپاراست لە هەموو تاوانێك، هەوڵی دەدا خوای گەورە رازی بکات، چونکە دەیزانی رەزامەندی خوای گەورە لە هەموو شتێك

گرنگترە، زۆربەی کاتی خۆی سەرقاڵ دەکرد بە زانستەوەو لە خزمەت مامۆستایاندا دەبوو یان وانەی دەوتەوە یان خۆی سەرقاڵ دەکرد بە نووسینی کتێبەوە تا موسڵمانان لێی سوودمەند بن.

کاتێ نوێژی دەکرد حەزی دەکرد ماوەیەکی زۆری پێ بچێت، ئیتر قورئانێکی زۆر زۆری دەخوێند و زۆر لە کڕنووش و سوجدەدا دەمایەوە، پاش نوێژەکەشی زۆر بە هێمنی و بێ پەلەکردن دادەنیشت و زیکری خوای گەورەی دەکرد، بەتایبەت کە نوێژی بەیانی دەکرد نەدەخەوتەوە، بەڵکو دادەنیشت یادی خوای دەکرد تا تەواو دنیا رۆشن دەبوو و خۆر هەڵدەهات.

ئیبن قەیم ماوەی رۆژانەی خۆی بە چەند کارێك دەبردە سەر، لەوانە: خۆی سەرقاڵ دەکرد بە نوێژ و پەرستشەکانەوەو لەوەشدا نموونەیەکی باڵا بوو، هەروەها لە قوتابخانەی جەوزی پێشەوایەتی دەکرد و وانەی دەوتەوە، هەروەها لە چەند شوێنێکی تری وەك صەدریە و شوێنانی تر وانەی دەوتەوە، ماوەیەکی دانابوو تایبەت بە کێشەکانی خەڵك و وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیان تا بەپێی بڕیاری شەریعەت کێشەکانیان بۆ روون بکاتەوەو چارەسەری دروستیان بخاتە بەردەست، کاتێکی تایبەتیشی دانابوو بۆ نووسینی کتێب و بابەتی گرنگ بۆ موسڵمانان، ئیتر نووسینەکانی هێندە زۆرن کە لە سەروو ٣٠ کتێبەوە دەبوون، کتێبەکانیشی هێندە بەهێزن کە بۆ هەموو کاتێك دەبن، ئێستاش لە کوردستاندا هەندێ لە کتێبەکانی کراون بە کوردی و چاپ کراون.

پرسیار: ئایا پەیوەندی نێوان ئیبن قەیم و ئیبن تەیمیە چۆن بوو؟

وەڵام: ئیبن قەیم خوێندکارێکی زۆر زیرەك و گوێڕایەڵی ئیبن تەیمیە بوو، بەڵکو لەسەر ئەوەی زۆر گوێی دەگرت لە ئیبن تەیمیە لەسەر ئەوە ئازارو نارەحەتی زۆری تووش بوو چونکە کەسانێك هەبوون حەزیان نەدەکرد ئیبن تەیمیە کەسی لە دەور

بێت و پێیان خۆش نەبوو ئەو هێندە زیرەك بێت، بۆیە دژایەتی خۆیشی و خوێندکارەکانی ئەویشیان دەکرد، ئەوەبوو کاتێ ئیبن تەیمیە بەند کرا ئیبن قەیمیش بەند کرا، بەلام دوای ئەوەی ئیبن تەیمیە مرد ئیتر ئیبن قەیمیان ئازاد کرد.

ئیبن قەیم منداڵێکی زیرەکی هەبوو کە ناوی ئیبراهیم بوو، ئەو منداڵەی لە لای ئیبن قەیمی باوکی وانەی دەخوێندو هەوڵی دەدا شوێن پێی باوکی هەڵبگرێت، هەموو خوێندکارەکانی ئیبن قەیم بوون بە زانای گەورە و دیاری ناو موسڵمانان وەك ئیمامی ئیبن کەسیر و ئیمامی ئیبن رەجەب و ئیمامی زەهەبی و چەندینی تر کە هەموویان خوێندکاری ئیمامی ئیبن قەیم بوون.

جارێکیان شەوی پێنج شەممە بوو، دەنگی بانگی عیشا لە مزگەوتەوە بەرز دەبوویەوە، لەو کاتەدا ئیبن قەیمی زانای خواناس کۆچی دوایی کرد، ئەمەش لە ساڵی ٧٥١ کۆچیدا بوو، ئیتر تەرمەکەی مایەوە تا موسڵمانان هەموویان بتوانن نوێژی لەسەر بکەن، ئەوەبوو بۆ بەیانیەکەی لەکاتی نوێژی نیوەڕۆدا لە مزگەوتی ئومەوی نوێژی لەسەر کرا، دواتر خەڵکەکە هێندە زۆر بوون کە دەیانویست نوێژی لەسەر بکەن کە لە مزگەوتی (جەراح) یش نوێژیان لەسەر کرد، ئینجا برا بۆ گۆڕستان و بە دەم فرمێسك و گریانەوە لە ناو قەرەباڵغیەکی زۆر و کەم وێنەدا تەرمی ئەو زانایەی ئیسلام خرایە ژێر خاك، خوای گەورە بەهەشتی بەرین بکاتە شوێنی و لە دۆزەخ بیپارێزێت و لە رۆژی دواییدا بە بینینی لە بەهەشتدا خۆشحاڵمان بکات.

# پەندو وانە

هەمیشە پێویستە بگەڕێین بە دوای زانستدا و هەوڵ بدەین زانایانی دەوروبەرمان بکەین بە مامۆستای خۆمان و زانستیان لێ وەربگرین تا بتوانین شوێن پێی زانایان هەڵبگرین و ببینە مایەی خێر و سوود بۆ دەوروبەرمان.

پێویستە هەوڵ بدەین کە گەورە بووین کتێبەکانی ئەم زانا گەورەیە بخوێنینەوە، هەروەها لە ئێستاشدا بە دایك و باوك یان مامۆستاکانمان بڵێین کتێبەکانی ئەو زانایە بخوێننەوەو باسیان بکەن بۆمان تا سوود وەربگرین لە زانستی هەرچەندە ئەو مردووە بەلام کتێبەکانی بە زیندووی ماونەتەوە.

پێویستە ئێمەی موسڵمان زۆر گرنگی بدەین بە یاد و زیکری خواو نوێژەکانمان بە جوانی بکەین و پەلە نەکەین لە نوێژەکانماندا، چونکە نوێژکردن قسەکردنە لەگەڵ خوای گەورە، هەروەها گرنگی زۆر زیاتر بدەین بە نوێژی بەیانی و یادکردنی خوا لە دوای ئەو نوێژە و ئەگەر بتوانین دوای ئەو نوێژە سەرقاڵی زیکر بین تا رۆژ دەبێتەوە.

## پرسیارەکان

١- ئیبن قەیم لە ساڵی چەند و لە کوێ لەدایك بوو؟

٢- شاری دیمەشق بە چی ناسراوە؟

٣- پەیوەندی نێوان ئیبن قەیم و ئیبن تەیمیە باس بکە.

٤- دەتوانیت ناوی هەندێ خوێندکاری ئیبن قەیم بهێنیت؟

٥- بۆچی ئیبن قەیم بەند کرا؟

٦- دەتوانیت باسی مردنی ئیبن قەیم بکەیت؟

٧- جوانترین شت لە ژیانی ئەم زانایەدا بەلای تۆوە چیە؟

# موحەممەدی فاتیح

لە ناو ئیسلامدا هەموو نەتەوەکان جێیان ئەبێتەوەو قبووڵ کراون، ئیتر لەخواترسان بەپێی رەنگ و نەتەوە نیە، بەڵکو ئەوەی بنەڕەتە لە ئیلامدا لەخوا ترسان وپەیرەوی جوانتری پەیامی ئیسلامە، بۆیە هیچ کات ئیسلام جیاوازی ناکات لەنێوان کورد و عەرەب و تورك و فارس و ئینگلیز و هەر نەتەوەیەکی تردا، بەڵکو جیاوازیەکە لەسەر ئەوەیە کامیان کاری چاکە زیاتر بکات، هەر بۆیە ئەو گەلانەی موسڵمان بوون هەوڵیانداوە پێشبڕکێ بکەن لە کاری چاکەو خزمەتکردن بە پەیامی خوادا.

یەکێك لەو نەتەوانەش تورکەکان بوون کە موسڵمان بوون و توانیویانە بە درێژایی مێژوو خزمەتی گەورە پێشکەش بکەن بە موسڵمانان، ئەگەرچی لەم دواییانەی مێژوودا کاتێ گوێڕایەڵی رێنماییەکانی پەیامی خوا نەبوون هەندێکیان ستەمی زۆریان کرد لە گەلی کوردی موسڵمان، بەڵام پێشتر تورکەکان زۆر باوەردار بوون و خزمەتی گەورەیان دەکرد بە ئیسلام و هەموو هەوڵیان بۆ ئەوە بوو ئیسلام بگەیەنن بەو شوێنانەی کە ئیسلامیان پێ نەگەیشتووەو دەوڵەتی ئیسلامی گەورە بکەن.

تورکەکان توانییان دەوڵەتێك دابمەزرێنن کە ناویان نا دەوڵەتی عوسمانی، ئەوەش لەبەر ئەوەی یەکەم کەس دایمەزراند ناوی عوسمان بوو، لەناو ئەو دەوڵەتەدا چەندین سوڵتانی بەهێز هاتن تا ئەوەی سوڵتانێکیان هات بە ناوی موحەممەد کە توانی رۆڵێکی گەورە ببینێت و ببێت بە یەکێك لەو کەسانەی کە گەورەترین خزمەتیان پێشکەش کرد بە موسڵمانان، وەك چۆن صەلاحەدینی کورد قودسی رزگار کرد، موحەممەدی تورکەکانیش قوستنتینیەی پایتەختی مەسیحیەکانی ئازاد کرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر لە سەردەمی خۆیدا هەواڵی دابوو بە هاتنی ئەم سەرکردەیە کاتێ بە هاوەڵانی خۆی فەرموو بە دڵنیاییەوە قوستەنتینیە ئازاد دەکرێت، بەراستی ئەو سوپایەی ئازادی دەکات سوپایەکی زۆر باشەو سەرکردەکەشی سەرکردەیەکی زۆر باشە.

موحەممەد لە ساڵی ٨٣٣ کۆچی لە شاری ئەدرنە لە تورکیا لەدایك بوو، باوکی ناوی موراد بوو کە سوڵتانی ئەو کاتی عوسمانیەکان بوو، دایکیشی ناوی هوما خاتوون بوو، ئیتر موحەممەد هەر لە سەرەتای ژیانیەوە لەناو کۆشك و دەسەڵاتدا لەدایك بوو، زۆر بە جوانی گەورە دەکرا و خزمەتی باشی دەکرا، باوکی مامۆستای تایبەتی بۆ دانابوو تا هەر لە منداڵیەوە وانە فێر ببێت، یەکێك لە دیارترین مامۆستاکانیشی مامۆستایەکی زانای گەورەی کورد بوو کە ناسرابوو بە شێخی گۆرانی.

بۆ ئەوەی موحەممەد فێری کاری بەڕێوەبردن بێت موردای باوکی بڕیاری دا موحەممەد بنێرێت بۆ ناوچەی ئەماسیا تا بەڕێوەبەردنی ئەوێی بداتە دەست، ئیتر بەوە فێری بەڕێوەبردن دەبێت، ئەو کات هێشتا تەمەنی موحەممەد یانزە ساڵ بوو، ئەوەش نیشانەی گرنگی پێ دانیەتی لەلایەن باوکیەوەو بەهێزیو زیرەکی موحەممەدیشە.

موحەممەد سەرەتا لەوێ زۆر گوێی نەدەگرت لە مامۆستاکانی، بۆیە باوکی بڕیاری دا مامۆستا و زانایەکی زۆر گەورەی بۆ بنێرێت تا جوان پەروەردەی بکات، ئەوەبوو شێخ ئەحمەدی گۆرانی بۆ نارد کە زانایەکی گەورەی کورد بوو.

شێخی گۆرانی هێندە لەلایەن باوکی موحەممەدەوە مۆڵەتی پێ درابوو کە ئەگەر موحەممەد تەمبەڵی بنواندایە یان لاریەکی هەبوایە شێخی گۆرانی بە دارێ لێی دەدا و

تەمێی دکرد تا جارێکی تر وا نەکات، هەروەها هەر لە سەرەتاوە شێخی گۆرانی بەردەوام ئەوەی فێری موحەممەد دەکرد کە فەتحکردنی قوستەنتینیە چەندە گرنگەو باسی فەرموودەی پێغەمبەری خوای بۆ دەکرد لەو بارەیەوە تا بتوانێت هەوڵ بدات کە لە داهاتوودا بوو بە سوڵتان ئەو کارە بکات، موحەممەدیش بە جوانی ئەوەی وەرگرت و کردی بە ئامانجی خۆی ئەگەر بوو بە سوڵتان ئەو کارە بکات.

لە ماوەیەکی کەمدا شێخی گۆرانی هەموو قورئانی خوێند بە موحەممەدو فێری وانەکانی شەریعەت و هەنگاوی خواترسی کرد، موحەممەدیش زۆر لەو مامۆستای دەترسا و شەرمی لێدەکرد چونکە زانایەکی زۆر گەورەو بەڕێز بوو، بەو جۆرە ئەو پەروەردەی موحەممەد لەسەر بنەمای ئیسلام زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر موحەممەد تا زۆر پەیوەست بێت بە شەریعەتی ئیسلامەوە، ئیتر موحەممەد زۆر هەوڵی دەدا ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) تایبەت بە فەتحی قوستەنتینیە ئەو بگرێتەوە.

سوڵتان موراد کە بینی موحەممەدی کوڕی چاك پەروەردە بووە بڕیاری دا واز لە دەسەڵات بهێنێت بۆ موحەممەدی کوڕی و خۆی بچێتە ناوچەیەکی دوور تا دوور لە سەختی دەسەڵات بژی، ئەوکات تەمەنی موحەممەد هێشتا ١٤ ساڵ بوو، بەڵام هێندە لەوێ نەبوو تا بیستی مەجەریەکان کە خەڵکێك بوون هەڵگەڕاونەتەوە لە دەسەڵات، بۆیە موحەممەد نامەی نووسی بۆ باوکی و داوای لێکرد خۆی بێتەوەو دەسەڵات بگرێتە دەست، ئەویش هاتەوەو سەرکردایەتی سوپای کردو جەنگێکی گەورەی دژ بە مەجەریەکان ئەنجامدا و تیایدا موسڵمانان سەرکەوتن.

ماوەیەك سوڵتان موحەممەد چوو بۆ شاری مانیساو لەوێ مایەوە، لەو ماوەدا ژنی هێنا، ناوی ژنەکەی ئامینە گوڵبەهار بوو کە بە بنەڕەت خەڵکی یۆنان بوو، دوای ماوەیەکی تریش ژنێکی تری هێنا کە ناوی ستتی بوو، ئەم ژنەی تورکمانی بوو، ئیتر

بەردەوام باوكی هاریكاری بوو تا كێشە گەورەكانی وڵات چارەسەر بكات چونكە هێشتا موحەممەد گەنج بوو و زۆر توانای چارەسەركردنی كێشە گەورەكانی نەبوو.

دوای ئەوەی باوكی كێشەكانی بۆ چارەسەر كرد ئەوەبوو لەو ماوەدا كۆچی دوایی كرد، بۆیە موحەممەدی كوڕی گەڕایەوەو شوێنی باوكی گرتەوە، پاش ئەسپەردەكردنی تەرمی باوكی ئیتر سوڵتان بە گەرمی كەوتە هەوڵی بەهێزكردنی دەوڵەتەكەی، چونكە دەیزانی نابێت مەرگی كەسە ئازیزەكان ببێتە هۆكاری وەستان لە خزمەتكردن و سەرخستنی ئایینی خوا و باوكیشی هەتا ژیا وا خزمەتی دەكرد بۆیە دەیویست ئەویش وەك باوكی بێت.

سوڵتان موحەممەد كەوتە ئامادەسازیەكی چاك بۆ ئەوەی ئاواتە گەورەكەی بەدی بهێنێت كە ئەویش فەتحكردنی شاری قوستەنتینیە بوو، لەوەشدا شێخی گۆرانی هاندەری بوو، بۆ ئەوەش سوڵتان سوپای ئامادە كرد و زانایانیش باسی جیهادیان دەكرد بۆ سەربازان تا بە گەرمی بجەنگن، دواجار هێرشیان برد بۆ سەر قوستەنتینیە و لە رووی دەریاو وشكانیشەوە هەڵمەتیان برد، بەڵام ئەوانیش بە سەختی بەرگریان دەكرد و نەیاندەهێشت موسڵمانان بچنە ناوی، ئیتر ژمارەیەكی زۆری موسڵمانان لەوێ شەهید بوون.

تەنها یەك رێگە مابوویەوە كە ئەویش گرتنی ناوچەیەكی ئاوی بوو دەبوو موسڵمانان لەوێوە بە كەشتی هێرش ببەن تا شارەكە بگرن، بەڵام رێگە نەبوو كەشتی بۆ ببەن.

پرسیار: ئەی سوڵتان بۆ چارەسەری ئەوە چی كرد؟

وەڵام: سوڵتان بڕیاری دا كارێكی زۆر سەخت بكەن، ئەویش ئەوەبوو بە شاخەكەدا كە لەنێوان ئەوان و شوێنە ئاویەكەدا بوو كەشتی ببەن بۆ ئەو شوێنە، ئەوەش بە شەو

بکەن تا دوژمن پێیان نەزانیت و بەیانی کتوپڕ هێرشیان بکەنە سەر، بۆیە سەربازانی موسڵمانان داریان دەبڕیەوەو دارەکانیان چەور دەکردن و بەسەرشاخەکەدا جادەیەکیان پێ دروست مرد ندواتر بە هەموویانەوە کەشتیەکانیان بەسەریاندا راکێشا و بردنیانە ناو ناوچە ئاویەکەوە، بەوە کە رۆژ بوویەوە دوژمنان تەواو سەرسام بوو و هیوای بەرگریکردنیان نەماو موسڵمانان توانییان دواجار قوستەنتینیە ئازاد بکەن.

کاتێ چوونە ئەوێ سوڵتان بڕیاری دا کەس بە ناهەق نەکوژ ن وخوێنی ژن و منداڵ وپیر و خەڵکی بێ تاوان نەڕژن، هەروەها سەربازانی کۆکردەوەو لە خۆشیدا دەستی کرد بە گریان و وتارێکی پێشکەش کرد و موژدەی ئەوەی پێ دان کە ئەوان توانییان ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لە خۆیاندا بەدی بهێنن کە ئەوەش گەورەترین موژدەیە.

کاتێ ناموسڵمانەکان ئەو لێبوردەیی و نەرمونیانەی سوڵتانی موسڵمانانیان بینی بەشێکی زۆریان موسڵمان بون و بۆیان دەرکەوت ئاینی ئیسلام چەند جوانی و چاکی لەخۆگرتووە.

سوڵتان موحەممەد بەم سەرکەوتنەوە نەوەستا، بەڵکو بڕیاری دا هێرش بباتە سەر ناوچەکانی تریش تا ئەو ناوچانەش بخاتە سەر خاکی موسڵمانان و ئاینی ئیسلامیان پێ بگەیەنێت، بۆ ئەوەش خوای گەورە سەرکەوتنی زۆری پێ بەخشی و بەو هۆیەوە چەندین ناوچە کەوتنە ژێر دەستی موسڵمانان و زۆرەی خەڵکەکەشی بە ئارەزووی خۆیان و بەبێ زۆر لێکردن موسڵمان بوون، چونکە کاتێ موسڵمانان دەچوونە ئەوێ و لەگەڵیان زۆر چاك بوون و باسی ئیسلامیان دەکرد بۆیان ئەوانیش سەرسام دەبوون بە ئیسلام و بە رەزامەندی خۆیان موسڵمان بوونی خۆیان رادەگەیاند.

هەروەها سوڵتان چەندە گرنگی دەدا بە جیهادی رێی خوا هێندەش گرنگی دەدا بە بواری زانست و خوێندنگەکان و لە بەشەکانی وڵاتدا چەندین خوێندنگەو زانکۆ و پەیمانگەی دروست کرد، گرنگی دا بە مەنهەجی خوێندن و رێزگرتنی زانایان و یارمەتی دانی خوێندکاران، هەروەها چەندین نەخۆشخانەی گەورەی لە بەشە جیاجیاکانی وڵاتدا بنیاد نا، بەشێکی زۆر کتێبی ناوازە بە بڕیاری ئەم سوڵتانە وەرگێرانە سەر زمانی موسڵمانان، چەندین بیناو دەزگای گەورەو گرنگ بنیاد نران، گرنگیەکی زۆری دا بە بواری ئابووری و بازرگانی زۆر پێشکەوت، هەوڵی دا ستەم لە وڵاتدا نەهێڵێت و مافی ستەم لێ کراوانی دەگێڕایەوە بۆیان، بەڵکو خەڵکی هەموان رازی بوون بە دەسەڵاتی ئەو سوڵتانەو نزای خێریان بۆ دەکرد، ئەویش تا دوا ساتەکانی تەمەنی خووی نەدایە تەمبەڵی و هەموو هەوڵی خۆی دەخستەگەڕ بۆ خزمەتکردنی خەڵك.

دواجار پاش خزمەتێکی زۆر و سەرکەوتنی گەورەی سوڵتان موحەممەد لە بوارە جیاجیاکاندا ئەویش وادەی مردنی هات و دواجار لە مانگی رەبیعولئەوەلی ساڵی ٨٨٦ کۆچیدا و لە تەمەنی پەنجاو سێ ساڵیدا سوڵتان موحەممەد کۆچی دوایی کرد.

# پەندو وانە

دەبێت بە جوانی ئەوە بزانین لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا گەورەیی و لەخواترسان بەپێی رەنگ و نەتەوە نیە، بەڵكو ئەوەی بنەڕەتە لە ئیلامدا لەخوا ترسان وپەیرەوی جوانتری پەیامی ئیسلامە، بۆیە هیچ كات ئیسلام جیاوازی ناكات لەنێوان كورد و عەرەب و تورك و فارس و ئینگلیز و هەر نەتەوەیەكی تردا، بەڵكو جیاوازیەكە لەسەر ئەوەیە كامیان كاری چاكە زیاتر بكات، هەر بۆیە ئەو گەلانەی موسڵمان بوون هەوڵیانداوە پێشبڕكێ بكەن لە كاری چاكەو خزمەتكردن بە پەیامی خوادا.

هەرچیەك فەرموودەی پێغەمبەری خوای (ﷺ) لەسەر بێت دەبێت ئێمەی موسڵمان زۆر گرنگی پێ بدەین چونكە ئەوە مایەی سەركەوتنمانە لە دنیاو قیامەتدا، دەبینین سوڵتان موحەممەد هەموو ماوەی تەمەنی خۆی دانا تا ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بیگرێتەوە، دەی ئێمەش پێویستە فەرموودەكانی پێغەمبەر(ﷺ) لە خۆماندا جێبەجێ بكەین و تەمەنمان دابنێین بۆ ئەو بوارە.

زۆر پێویستە رێزی تایبەتی مامۆستایان بگرین چونكە ئەوان دڵسۆزی ئێمەن و كاتی خۆیان تەرخان دەكەن بۆ ئێمە تا زانستمان فێر بكەن و رێی راستمان نیشان بدەن و ماندوبوونی خۆیان لەبیر دەكەن لەبەر ئێمە.

- جیهادكردن لەرێی خوادا و زانست فێربوون و بڵاوكردنەوەی زانست لە ناو خەڵكدا دوو بواری تەواوكەری یەكترن‌و بە درێژایی مێژووی ئیسلامی موسڵمانان بە جێبەجێ كردنی هەردووكیان سەركەوتنیان بەدی هێناوە.

# پرسیارەکان

١. سوڵتان موحەممەد لە ساڵی چەند و لە کوێ لەدایك بوو؟

٢. سوڵتان موحەممەد سەر بە چ نەتەوەیەك بوو؟

٣. تەمەنی منداڵی سوڵتان موحەممەد چۆن بوو؟

٤. ئەو مامۆستا کێ بوو کە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر سوڵتان موحەممەد؟

٥. بۆچی سوڵتان موراد بۆ جاری دووەم خۆی بوویەوە بە سوڵتان؟

٦. بۆچی سوڵتان موحەممەد هەوڵی دەدا قوستەنتینیە ئازاد بکات؟

٧. سوڵتان موحەممەد چۆن قوستەنتینیەی ئازاد کرد؟

٨. ئایا دوای ئازادکردنی قوستەنتینیە سوڵتان موحەممەد چی کرد؟

٩. دەتوانیت ئەم چیرۆکە زۆر بە کورتی بنووسیتەوە؟

# پێڕست

